

## شیعر



## چیرۆك



## لێكۆڵینەوە

## ئەزموون

دەروونڕۆشنیی شیعری		سەباح ڕەنجدەر

## خوێندنەوەی کتێب

ئاسەوارەکانی جەنگ و مەرگی بەختەوەری لە ڕۆمانی نەتەوەی زێرابەکان دا		پشتیوان هەڵەبجەیی

## گفتووگۆ

عەلی ئەشرەف دەروێشیان		بابەك سەحرانەوەرد
گوڵی تەرەقی		بەیان ڕەشیدی

## شانۆ

کۆتایی گەمەی سامۆیل بێکێت
شادی عەبدوول



تی ئێس ئیلیۆت
داستان بەرزان
ئیسماعیل حەمە ئەمین
داستان مارف
مەحمود نەجمەدین



# چوارشەممەی خۆڵەمێش[1]

**تی ئێس ئیلیۆت**
**و. لە ئینگلیزییەوە: ماردین ئیبراهیم**

ا

چونکە ئومێدەوار نیم جارێکی دی وەرسووڕێم
چونکە ئومێدەوار نیم
چونك ئومێدەوار نیم وەرسووڕێم
ئارەزووی دیاریی فلان پیاو و ئامانجی فیسار پیاو بکەم
من چیدی هەوڵ بۆ ئەم جۆرە شتانە نادەم
"پیرەهەڵۆ بۆچی دەبێت باڵەکانی ئاوەڵا بکات؟"



بۆ دەبێت من شیوەن بکەم
بۆ دەسەڵاتی پایەماڵکراوی سەردەمی عادەتیی؟

چونکە من ئومێدەوار نیم جارێکی دی
شکۆی ئوفتادەی ساتی ئەرێنی بزانم
چونکە من پێم وانییە
چونکە من دەزانم کە دەسەڵاتێکی ڕاگوزەری حەقیقی ناناسم
چونکە ناتوانم بخۆمەوە
لەوێ، کە درەختی گوڵەکانی لێیە و کانیاوەکان هەڵدەقوڵن، ئیدی شتێکی دی نابێت

چونکە دەزانم ئەو کاتە هەمیشە هەر کاتە
شوێنیش هەمیشە هەر ئەو شوێنە و تەنیا شوێنە
و ئەوەی ڕاستەقینەیە، تەنیا بۆ یەك جار ڕاستەقینەیە
و هەر بۆ یەك شوێن
من ئاهەنگ بۆ شتەکان دەگێڕم وەك ئەوەی کە هەن و
دەستبەرداری سیمای تەبەڕوککراو دەبم
هەروەها دەستبەرداری دەنگیش دەبم
چونکە ناتوانم ئومێدەوار بم جارێکی دی وەرسووڕێم
پاشان ئاهەنگ دەگێڕم بۆ ئەوەی کە شتێکم بنیاد ناوە
ئاهەنگی بۆ بگێڕم



دوعاش بۆ ئەوەی خوا ڕەحممان پێبکات
دوعای ئەوەش کە ڕەنگە من لە یادیان بکەم
ئەو شتانەی لەگەڵ خۆمدا زۆر دەیانلێمەوە
زۆر لێکیان دەدەمەوە
چونکە من ئیدی ئومێد ناخوازم جارێکی تر وەرسووڕێم
با ئەو وشانە وەڵام بن
بۆ ئەوەی کە ڕووی داوە، جارێکی دی ڕوو نەداتەوە
بەڵکو حوکمەکە **2** زۆر قورس نەبێت لەسەرمان

چونکە ئەو باڵانە چیدی باڵ نین بۆ فڕین
بەڵکو تەنیا پەروانەن بەر هەوا دەکەون
هەوایەك کە ئێستا زێدە کەم و وشکە
کەم و وشکترە لە وەسیەتەکە**3**
فێرمانکە بایەخ بدەین و ئەرخەیان بین
فێرمانکە لە جێی خۆمان ڕۆنیشین

دوعا بۆ ئێمەی گوناهبار بکەن، ئێستا و کاتی مردنمان
دوعامان بۆ بکەن ئێستا و کاتی مردنمان



## II

خانمەکەم، سێ بەوری سپی لەژێر داری عەرعەردا وەرکەوتن
لە فێنکایی ڕۆژدا، دوای ئەوەی هەتا تێر بوون خواردیان
لە قاچەکانم، لە دڵم، لە جگەرم و هەروەها لەو شتەش کە لە ناو خڕایی جومجومەمدا بوو.
خواش وتی
ئەو ئێسقانانە بژین؟ ئەو ئێسقانانە
بژین؟ ئەو شتەی لە ناو ئێسقانەکانمدا بوو "کە پێشتر وشك ببووەوە" بە چرپەوە وتی:
لەبەر چاکەی ئەو خانمە، لەبەر لەبەردڵانییەکەی، چونکە
لە ڕامانەکانیدا پاکیزە ستایش دەکات، **4**
ئێمە لە ڕەونەقدا دەدرەوشێینەوە. ئەوەتام لێرە پارچەپارچەم
چاکەکانم بە لەبیرچوونەوە دەسپێرم، عەشقیشم
بە زوڕیەتی بیابان و بەری کولەکە.
ئەمە ئەوەیە کە هەناوم چاك دەکاتەوە
ڕیشاڵەکانی چاوم و ئەو بەشانەی کە هەرس ناکرێن
لە لایەن بەورەکانەوە وەلا دەنرێن. خانمەکە بە فستانێکی
سپییەوە، خۆی خزاندووەتە
ناو ڕامانەکانەوە، بە فستانێکی سپییەوە.
با سپیایەتیی ئێسقانەکان تۆبەی بیرچوونەوە بکەن.
زیندەگییان تێدا نییە. وەك ئەوەی لە یاد کرابم



لە یاد دەکرێم، بۆیە منیش لە یاد دەکەم
بەمەش سەرنج دەدەمە مەبەستەکەم و خۆمی بۆ تەرخان دەکەم. خواش وتی
پێشگۆیی با بکەن، تەنیا با، چونکە تەنیا
با دەژنەوێت. ئێسقانەکانیش جریوەجریو گۆرانییان گوت
بە قورسایی کوللەیەك دەڵێن

ئەی خانمی بێدەنگییەکان
پەشۆکاو و هێمن
پارچەپارچە و تەواو
ئەی گوڵی یادەوەری
ئەی گوڵی فەرامۆشی
ئەی ماندوو و ژیانبەخش
ئەی قەلەقێکی دڵنیا
گوڵێکی تەنیا
ئێستا باخچەیەکە
کە عەشق تیایدا کۆتایی دێت
کە ژانی عەشقێکی ناکام تیایدا تەواو دەبێت
ژانێکی گەورەتری عەشقێکی بەئاکامگەیشتوو
کۆتایی ناکۆتا
سەفەر بەرەو کۆتایی



کۆتایی هەموو ئەو شتانەی
کۆتاییان نایەت
قسەی بەبێ وشە و
وشەی بەبێ قسە
ستایش بۆ دایك[5]
بۆ باخچەیەك
کە عەشق تیایدا کۆتایی دێت.

لەژێر درەختی عەرعەردا ئێسقانەکان گۆرانییان گوت، پارچەپارچە و درەوشاوە
ئێمە شادین کە پارچەپارچە بین، ئێمە زۆر کەم چاکەمان بەرامبەر یەکتر کرد
لەژێر درەختێکدا لە فێنکایی ڕۆژدا، لەگەڵ بەرەکەتی لمدا
خۆیان و یەکدی لە یاد دەکەن، ئاوێتەبوو
لە سکوونی بیاباندا. ئەمە ئەم خاکەیە کە ئێمە
بە قورعە دابەشی دەکەین. نە یەکبوون و نە پارچەپارچە بوون
ئیدی مەسەلەیەك نین. ئەمە خاکەکەیە. ئێمە میراتی خۆمان هەیە.



III

لە پێچی یەکەمی پلەی دووەمدا
وەرچەرخام و ژێر خۆم بینی
هەمان ئەدگار بەسەر مجەرەکە خۆی شۆڕ کردبووەوە

لەژێر هەڵم و لە ناو هەوایەکی کەسکووندا
لە ململانێدایە لەگەڵ شەیتانی پلیکانەکە کە
سیمایەکی گومڕاکەری هیوا و بێهیوایی دەپۆشێ

لە پێچی دووەمی پلیکانەی دووەمین
لێیان گەڕام بچەمێنەوە و بەرەو خوارێ خۆیان شۆڕ بکەنەوە؛
چیدی ئەدگاری دیکەی لێنەبوو و پلیکانەکە تاریک بوو،
شێدار، دادڕاو، وەك دەمی پیاوێکی پیر لیکی لێبێت و
چاك نەبێتەوە،
یاخود وەکو دانە کەلوکۆمەکانی قرشێکی پیر.

لە پێچی یەکەمی پلیکانەی سێیەم
پەنجەرەیەکی کەلێندار هەبوو، کە وەکو هەنجیر ورگی دابوو
لە پشت شکۆفەی درك و دیمەنی لەوەڕگایەك
فیگەرێکی پان، سەوز و شینپۆش
بە فلوتێکی دێرین زەمەنی گوڵانی ژەنی
پرچی پەرێشان شیرینە، پرچی قاوەیی بەسەر دەمدا
پەرشوبڵاوە
ئەرخەوان و پرچی قاوەیی؛
کەیفوسەفا، سەدای فلوتەکە دەوەستێت و هەنگاوەکانی



عەقڵ بەسەر پلیکانەی سێیەمدا
دیار نامێنێت، دیار نامێنێت؛ هێزی ئەودیو هیوا و بێهیوایی
بە پلیکانەی سێیەمدا سەردەکەوێت.

خوداوەندا، من شایستە نیم
خوداوەندا، من شایستە نیم
بەڵام تەنیا وشەکە بڵێ.

IV

ئەوەی لە نێوان وەنەوشە و وەنەوشەدا ڕێی کرد
ئەوەی بە نێوان چینە جیاوازەکانی سەوزییە جیاوازەکاندا ڕۆیشت
بە جلی سپی و شینەوە، ڕەنگی مریەم
دەربارەی شتگەلی ناپێویست دەدوێت
بە جەهل و زانینی خەمی ئەبەدییەوە
ئەوەی بە نێوان ئەو کەسانەدا ڕابرد کە ڕابردوون
ئەوەی کە ئیتر وای کرد فوارەکان بەهێز بن و کانییەکان
بژێنەوە

وای کرد بەردە وشکەکان سارد بن و لمەکە تۆکمە بێت



به جلی شینی عایقییەوە، شینی ڕەنگی مریەم،
سۆفێگنافۆس6

ئەمە ئەو ساڵانەن کە بە نێواندا دەڕۆن،
لەگەڵ خۆیدا کەمانچە و فلوتەکان هەڵدەگرێت
لەگەڵ خۆیدا ژنێك دەگێڕێتەوە کە لە کاتدا،
لە نێوان خەو و بێداریدا دەجوڵێت،
لە ڕووناکییەکی سپییەوە پێچراوە
ساڵەکان دەگێڕێتەوە لە ڕێگای هەورێکی ڕوونی فرمێسکەکان،
سەروا کۆنەکان لە شیعری تازەدا دەگێڕێتەوە
قوربانی بۆ زەمەن
قوربانی بۆ دیدی نەخوێنراوەی خەونە باڵاکە
لە کاتێکدا یەك قۆچی بە زێڕ و زەمبەلەك ڕازاوە
کەژاوەی زێڕینی مردوان ڕادەکێشێت

خوشکی بێدەنگ بە سپی و شین خۆی داپۆشیوە
لە نێوان درەختی تەقسووس، لە پشت خوای باخچەوە
کە بێهەوایە فلوتەکەی، سەری دانەواندووە و ئاه
هەڵدەکێشێت بەڵام قسەیەك ناکات



بەڵام فوارەکە تەقییەوە و باڵندەکە گۆرانیی چڕی
قوربانی بۆ زەمەن، قوربانی بۆ خەون
میرنشینی قسەی نەبیستراو و نەوتراو

تاکو با هەزار چرپە لە درەختی تەقسووس دەتەکێنێت
ئینجا مەنفای ئێمەی بەدوودا دێت

٧

ئەگەر وشەی ونبوو ون بوو، قسەی سەرفکراو سەرف کرا
ئەگەر قسەی نەبیستراو و نەوتراو
نەوترا و نەبیسترا
وشەی نەوتراو و نەبیستراو
وەك وشەی بێ وشە دەمێننەوە،
وشە لە جیهاندا و بۆ جیهان
و ڕووناکایی لە تاریکیدا درەوشایەوە
و لە بەرامبەر وشەدا جیهانی پڕ هەیەجان دەخولێتەوە
بە دەوری سێنتەری وشەی بێدەنگدا

ئاە ئەی قەومی من، چیم لە ئێوە کرد



لە کوێ وشە بدۆزرێتەوە، لە کوێ وشە هاوار دەکات
لێرە نا، بێدەنگی کافیی لێنییە
لەسەر ڕووی دەریا یاخود لە دوورگەکان نا،
لەسەر وشکایی نا، لە بیابان یاخود خاکی
باراناوی نا،
بۆ ئەوانەی لە تاریکیدا ڕێ دەکەن[7]
لە ڕۆژدا بێت یان شەو
کاتی دروست و شوێنی دروست لێرە نییە
شوێنی ناز و نیعمەت بۆ ئەو کەسانە نییە کە خۆیان لە 'سیما' لادەدەن
کاتی گوشاد نییە بۆ ئەوانەی بە ناو ژاوەژاودا
دەڕۆن و ئینکاری دەنگەکە دەکەن

ئایا خوشکی پەچەپۆش دوعا دەکات بۆ
ئەوانەی بە ناو تاریکیدا دەڕۆن، ئەوەی تۆ هەڵدەبژێرێت و دژت
دەوەستێت،
ئەوانەی لە تەپڵی سەرەوە دابەش بوون لە نێوان وەرزێك و
وەرزێکی تردا، نێوان کات و کاتدا، نێوان
کاتژمێر و کاتژمێردا، وشە و وشەدا، هێز و هێزدا، ئەوانەی
چاوەڕێن
لە تاریکیدا؟ ئایا خوشکی پەچەپۆش دوعا دەکات



بۆ مندالانی بەردەم دەروازەکە
ئەوانەی نارۆن و ناتوانن دوعا بکەن:
دوعا بکەن بۆ ئەوانەی هەڵدەبژێرن و دژ دەوەستن

ئۆهـ قەوم و قیلەی من، چیم  لە ئێوە کرد.

ئایا خوشکی پەچەپۆشی نێوان درەختە زراڤەکانی
تەقسووس دوعا دەکات بۆ ئەوانەی ئازاری دەدەن
تۆقیون و ناتوانن تەسلیم بن
پێدادەگرن لە بەرامبەر دنیا و لە نێوان تاوێرەکاندا ئینکاری دەکەن
تاوێرەکانی دواهەمین سەحرا پێش دواهەمین باخچەی بیابان لە بیابانی
وشك و برنگدا، دەنکە سێوە کۆنەکە تف دەکەنەوە.

ئۆهـ قەوم و قیلەی من.

## VI



لەگەڵ ئەوەشدا من هیواخواز نیم جارێکی دی
وەرسووڕێم
لەگەڵ ئەوەشدا من هیواخواز نیم

لەگەڵ ئەوەشدا من هیواخواز نیم وەرسووڕێم

لە نێوان قازانج و زیاندا دێم و دەچم
لەم ڕێگوزەرە کورتەدا کە خەونەکان پیایدا تێدەپەڕن
ئێوارەیەکی خەونگرتوو لە نێوان لەدایکبوون و مردن
"موبارەکم بکە باوکە"8 لەگەڵ ئەوەی کە من حەز ناکەم دڵم بۆ ئەو شتانە بچێت
لە پەنجەرەی کراوەوە بە ڕووی کەناری بەردیندا
هێشتا چارۆگە سپییەکان ڕووەو دەریا دەڕۆن
ڕووەو دەریا دەڕۆن بە باڵی ساغ و سەلیمەوە
و دڵی ونبوو ڕەق دەبێت و گوشاد دەبێت
لە ئەرخەوانی ونبوو و دەنگی ونبووی دەریا
و ڕۆحی لاواز بە پرتاو ڕادەپەڕێت
چون تووڵی چەماوەی زێڕین و بۆنی ونبووی دەریا
ڕادەسێن بۆ دەستخستنەوەی
گریانی قەتێ و سووڕانەوەی زیقاوڵە
و چاوانی کوێر دەیخولقێنێت
دیمەنگەلی خاڵی لە نێوان دەروازەگەلی عاجی
و بۆن تامی نمەکینی زەوی لماوی نوێ دەکاتەوە ئەمە کاتی
گرژیی نێوان
مردن و ژیانە، شوێنی دوورەپەرێزییە ئەو شوێنەی سێ



خەون لە نێوان تاوێرگەلی شیندا تێدەپەڕن، بەڵام
کاتێك ئەو دەنگانەی لە درەختی تەقسووسەوە دەکەونە خوارێ، دەلەرزن
لێگەڕێ درەختە تەقسووسەکانی دی بلەرزن و وەڵام بدەنەوە

ئەی خوشکی موبارەککراو، دایکی پیرۆز، ئەی ڕۆحی فوارە، ڕۆحی باخچە،
مەهێڵە خۆمان بە زەیف و درۆ داپۆشین
فێرمان بکە بە ڕەحم بین، فێرمان بکە ئەرخەیان بین
فێرمان بکە بە هێمنی دابنیشین
تەنانەت لە ناو ئەو تاوێرانەشدا،
ئاشتی ئێمە لە ئیرادەی ئەودایە
و تەنانەت لە ناو ئەو تاوێرانەشدا
ئەی خوشکێ، ئەی دایە
ئەی ڕۆحی ڕووبارەکە، ڕۆحی دەریاکە،
مەهێڵە داببرێم

رێگە بدە گریان و فوغانم بۆ لات بێت 9





1 چوارشەممەی خۆڵەمێش بە دواهەمین چوارشەممەی ساڵی تازە دەڵێن، کە دەکەوێتە پێش جەژنی ئیستەر و کریستیانەکان لەو ڕۆژەدا دەست بە ڕۆژووگرتن دەکەن. ئیلیۆت ئەم شیعرەی دوای گەڕانەوە بۆ ئاینی مەسیحی نووسیوە.

2 ئیلیۆت لێرەدا مەبەستی حوکمی خودایە لە ڕۆژی قیامەتدا.

3 ئیلیۆت لێرەدا دەبێت مەبەستی لە وەسیەتەکە هەر ئەو دوعایە بێت، کە لە کەنیسەدا و بە تایبەت لە کەنیسەی کاسۆلیکی لە کاتی نوێژدا دەخوێنرێت: فێرمانکە بایەخ بدەین و ئەرخەیان بین، فێرمانکە لە جێی خۆمان ڕۆنیشین، دوعا بۆ ئێمەی گوناهبار بکەن، ئێستا و کاتی مردنمان، دوعامان بۆ بکەن ئێستا و کاتی مردنمان.

4 مەبەستی مەریەمی دایکی عیسایە.

**5** مەبەستی مەریەمی پاکیزەیە.

**6** لێرەدا ئیلیۆت ئەم وشە ئیتالیە کۆنەی بەکار هێناوە، کە ئاماژەیە بە دێڕێکی دانتی، مانای وشەکە جولاَنەوە و ڕەفتارکردن و قسەکردنە بە هۆشیاری و وریاییەوە، کە بێگومان تۆنێکی ئایینیی هەیە و مەبەست لێی ئەوەیە، کە دەبێت وریا و هۆشیار بین کە چی دەکەین.

**7** ئاماژەیە بۆ ڤێرسێك لە کتێبی پیرۆز. وەرگێڕ

**8** لە کڵێسای کاسۆلیکیدا لە کاتی دانپیاناندا دەوترێت.

**9** لە کاتی نوێژدا لە کڵێسا دەووترێت.

سەرچاوە:

Ash_Wednesday', from Collected Poems 1909_1962 by T S Eliot, © T S Eliot'
1963, Faber & Faber

Limited



# ئورهان پاموك

# ڕەنگەکانی تر

لە سویدییەوە: هیوا قادر





# ئۆفیلیا

## داستان بەرزان



ناتوانم گوێ بۆ شۆفێری ئەم تاکسییە ڕادێرم
کە بێپەروا باسی شۆڕشم بۆ دەکات و
پێی وایە: شۆڕش دەتوانێت ژیانمان چاك بکات.

٢٥ ئەوەبێ/ دەم

من لە شۆڕش تێنەگەیشتووم و
کاتی ئەوەشم نییە.

حەزەکەم لە تاکسییەکە دابەزمە قەراغی شۆستەکە
وەك منداڵێکی ئەفریقی سەرم بخەمە ناو هەردوو دەستم و
تێر بگریم
فرمێسەکانم ببنە هەرمێ
بە شەقامەکەدا گلۆر ببنەوە
وەك قەرەجێکی دڵشکاو بە نێوان سەیارەکاندا بڕۆم و
تێر بگریم
فرمێسکەکانم ببنە شووشەعەتر
لەسەر شەقامەکە بشکێن.

بە قسەکانی شۆفێرەکەدا ئەو شەوەم بیر دەکەوێتەوە
کە لەبەر پێمدا چوویتە سەر ئەژنۆکانت
زمانت خستە بەینی پەنجەکانی دەستمەوە
لە تاریکییەکەدا سەرێکت بۆ هەڵبڕیم
بریسکەی خەنجەرێکم لە چاوەکانتدا بینی
ئازارێکی باریك کەوتە کاسەی سەرمەوە.

ئەو شەوەم بیر دەکەوێتەوە
کە خۆت هاویشتە باوەشمەوە و
گوتت: برینەکانت لە جەستەمدا هەڵدەگرم
لەو کاتەدا درۆیەك هەوای ژوورەکەی پیس کرد
لەنگییەك کەوتە قوڵایی بوونمەوە
لە تاو ئازار برینەکانم داگیرسان.

شەوەکانی قسەکردنم بیر دەکەوێتەوە
لە دووریی دوو شارەوە
تا بەیانی لەسەر دەستم بوویت
ڕۆژەکانی پێکەوەبوون
لە کافتریاکەدا دادەنیشتین
حەزت دەکرد بڕژێمە ناوتەوە.

دەزانم تۆ لە بیرت کردووە
نانخواردنی نیوەڕۆکە
پیاسەی کۆڵانە باریکەکە
پاڵکەوتنی بەر هەتاوەکە



ئەو شەوەی مانگ لە تەڕایی چاوەکانتدا دیار
بوو
ئەو ڕۆژەی حەزم دەکرد لە باوەشتدا بمرم.

لە بیرت کردووە
ماچکردنی ناو حەمامەکە
بۆنی شامپۆ و سابوونەکە
پێکەوەوەستانی بەردەم دووشەکە
کەفی هەڵچووی سەر جلشۆرەکە
هەردووکمان کە نوقمی ئارەقە بووین
بە هەناسە سوارییەوە دەمانگوت:
دونیا یەعنی ئەم ساتەوەختە.

ئەو خاولییە سپییەت لە بیر کردووە
کە لە ئامێزی گرتبووین
ئەو نوێنە سەوز و سوورانەی
کە لە گەرمیی ئێمە وەڕس ببوون.

گریانەکان

بزە و
خەمەکان
شەڕەکان
باران و
پیاسەکان
هەموویانت لە بیر کردووە.

لە بیرت کردووە
کە من لە ناو تۆوە هاتمەوە ناو ژیان
لە بیرت کردووە
کە تۆ بە خوێنی من برینەکانت سارێژ بوون.

لە جامی تاکسییەکەوە سەیری دەرەوە دەکەم
دونیا لە بەرچاوم شین..شین دەنوێنێت
شۆفێرەکە پێ بە بەنزیندا دەنێت و
پێداگیریی لەسەر بۆچوونەکانی دەکات
منیش زیاتر دڵم تەنگ دەبێت و
بە نەشازیی دونیا و
ئەم ژیانە سکرابەم هێڵنجم دێت.



نینۆکە درێژەکانتم بیر دەکەونەوە
بە ناو مووەکانی سەر سنگمدا دەتگەڕاندن
ئەو دەمەی خۆت بە سەرمدا دەدا و پێت دەگوتم:
ژیان لە دەرەوەی ئەم عیشقەمان وێرانەیە.

جانتا سوورەکەتم بیر دەکەوێتەوە
ئاوەدانبوو بە مت و مورووی ڕەنگاوڕەنگ
هەریەکەیان ئاماژە بوون بۆ ژوانێك
مانگ لە جانتاکەی تۆوە دەردەکەوت
لە قژتدا ئاوا دەبوو.

گوڵە یەخەکەتم بیر دەکەوێتەوە
بۆنی نیلوفەری دەپرژان بە ژوورەکەمدا
دەمی پڕ دەکردم لە تامی ژیان
هەوای ماڵەکەمی سوور هەڵدەگەڕاند.

نقێمە وردەکەی سەر گۆنات
دڵی تاریکمی ڕووناك دەکردەوە
لەبەر جلیوەیدا بێدەنگ دادەنیشتم

تاکو چاوانمی سەرڕێژ دەکرد لە بریقە.

تامی مەمکەکانت
تامێك بوو، وەکو شەربەتی گێلاس
بۆنی جەستەت
بۆنێك بوو، وەکو شەرابی سپی
درەوشانەوەی ناوکت
درەوشانەوەیەك بوو، وەکو دەنکەهەنارێك
لەبەر تیشکی خۆری ئێوارەدا.

لیکی دەمت
کە لەسەرم دەبوویت
دەتکایە ناو دەممەوە
هەر بۆ ئەوەی نەخنکێم و
بڕێکی تر بەرگەی وشکەساڵی بگرم
زۆرجار  بیری لێدەکەمەوە.

پێیەکانت
پاوانەکانت
هەنگاوەکانت



تووڕەیی و

شێتی و

دڵڕەقییەکانت

وەك ئەوانەی لە دەستم چوون

بیریان دەکەم.

چروتێك بە یادی لێوەکانت دەکێشم

بیر لە ژیانم دەکەمەوە

هیچم نییە دڵم پێی خۆش بێت

هیچم نییە لەپێناویدا بژیم

بزە دەمگرێت کە دەبینم

فرمێسکەکانم لە جامەکەوە دەکەونە سەر شەقامەکە

وەك هەرمێ گلۆر دەبنە

وەك شووشەعەتر دەشکێن.

(دادەبەزمە سەر شەقامەکە).

وەك ئەوەی جارێکی دیکە دونیا نەبینمەوە

بە دەستێکم ئارەقەی ماندوویێتی دەسڕم

بە دەستەکەی دیکەم سڵاوێك لە ئاسمان دەکەم.

ماڵئاوایی لە شۆفێرەکە دەکەم
لە خۆری ئێوارانی زستان
لە بینینی کێڵگەی گوڵەبەڕۆژە
لە دەنگی ڕژانی ئەستێرە.

ماڵئاوایی لە شەربەتی سێو و
کافتریاکان دەکەم
لە ئاگری شەرابی سپی
لە سووتانی مۆمی مێو
لە تامی هەنگوین و ڕەشکە
لە بۆنی گوڵەگەنم.

ماڵئاوایی لە دەستخستنەناو ئاوی سارد و
کارێزی وەستا شەریف دەکەم
لە پیاسەی باخچەی گشتی
لە ڕۆیشتن بەدەم خەیاڵەوە
لە نەرمیی لمی ڕۆخی دەریا
لە زبریی توێکڵی کاڵەك.



(دەچمە قەراغی شۆستەکە)

وەك ئەوەی جارێکی دیکە دونیا نەبینمەوە
به دەستێکم ئارەقەی ماندوێتی دەسرِم
به دەستەکەی دیکەم سڵاوێك له زەوی دەکەم.

(هەنگاو دەنێمە سەر شۆستەکە)

ژیانە سکرابەکەم  لەوێدا ڕادەگرم
ئەم شیعرەش لێرەدا دەوەستێنم.

جوونی2014
هەولێر/ سلێمانی

# کوڕم نالی ناشرینی ناهێڵێت بتبینم....

ئیسماعیل حەمەئەمین

نالیی بچوکم، کوڕی ڕۆحم
ئەم جیهانە ناشرینیی خۆش دەوێت.
ئەم دونیایە تەنها شوێنی ناشرینەکانە
ئەم مانگە، ئەم خۆرە، ئەم ئەستێرە و هەورانە
تەنها بە دەوری ناشرینیدا دەسووڕێنەوە.
من تەنها لەژێر ئاسمانی ناشرینیدا دانیشتووم و خەون بە کوڕە
جوانەکەمەوە دەبینم
دەمەوێت منداڵیی لێ تێك بدەم و پێی بڵێم : ناشرین بە
کوڕم
چونکە باوکت ئەوەندە بەدووی جوانیدا گەڕا،
تاوەکو خەریکە لەم خەرەندەوە خۆی هەڵداتە خوار
و بڵێت: ماڵئاوا جوانییەکان

ئاخر کوڕم کێها لەم دونیایەدا جوانیی دەوێت، کە بۆ ناشرینی خولقاوە!
کوڕم ناشرین بە بۆ ئەوەی باش، زۆر باش بژیت
کوڕم هەڵەی من دووبارە مەکەرەوە و بە هەورەکان مەڵی؛ ئێوە بۆ من
خولقاون
مەڵی من خواوەندم ئازیز و تۆش مەئشوقی من
بە دوای ماناکانی ئەشق و مرۆڤ و گەردووندا مەگەڕێ
مەڵێ من وەك خەیام بیر لە یەکەم و تۆش بیر لە چەندان دەکەیتەوە.
مەڵی وجود کێشەی منە تا دەمرم.
خەوبینەر مەبە وەك باوکت، شاعیر مەبە و مەڵی ڕۆح لە نێو خەیاڵدایە
مەڵی خودایەکی میهرەبان لە نێو ئەم جامە ئاوەدایە،
مەڵێ من کوڕی خواوەندێکم، ڕۆژێك دەڕۆمەوە بۆ لای
مەڵێ چرکەساتێکی ئەشق، شەراب، قاقای هاوڕێیانی دڵساف بۆ من بەسە
کوڕم خەیاڵت نەڕوات بۆ دونیایەکی تر، جگە لە دونیای ناشرینەکان نەبێت
بمێنە ئەی منداڵی من، بمێنە کوڕە بچوکەکەم نالی
لەوە تێبگە جوانترین ژیان
سەرکەتووترین ژیان،
ژیانی ناشرینەکانە.

کۆڵن
دێسمبەری ٢٠١٤

# دەگەڕێمەوە و دەبمە دیوار

**داستان مارف**

لەوسەری گشت شتەکانەوە دێمەوە
لە بنی گەردوونەوە تا ئێرە خەمم هاوردووە
بیابانێك تۆزم لێنیشتووە و
گوێم لە خوڕەی خوێنبەرەکانمە
وەك ڕزگارکەرێك سەیرم دەکەن
لە بڵندگۆکانەوە شکستەکانم دەکەمە چیرۆك





له چیرۆکەکاندا پاڵەوانەکان بێنرخ دەکەم
هەموان دەستیان لەسەر برینەکانیان داناوە و
چاوەڕێی پەرجوویەکی منن
عەساکەم فڕێ دەدەم و دەبێتە چۆلەکە
خۆم لە قسەی دڵم دەدزمەوە و دەڵێم:
"باڵەکانتان بکەنەوە
دایکەچۆلەکەی ئازیز ڕێبەریمان دەکات"
دروستیی قسەی دڵم ئەمە بوو:
ئیدی چۆلەکە ڕابەرمانە و
بە ئاسک دەڵێین نیشتیمان و تاوسیش ئاڵا
سنوورمان بۆنی نارنجە و پەرستگە تەنها دڵمانە
مەبەستمە بڵێم
ئەوەی هیچمان نییە
ئەوەی بە هیچمان ناشێ
مرۆڤە
***
ڕۆژێك وەك سەربازێکی پێکراو
لە جەنگێکی درێژخایەن دەگەڕێمەوە
ڕۆژێك تەنها ڕزگاربووی ناو کەشتییەکم
ڕۆژێك لە سیستەمی زەویدا گیر دەخۆم و دەخنکێم



ئەدەبی سەردەم

بەندییەکی بێدەنگی بەندیخانەیەك منم
زامێك نا ناڵەیەك لەسەر دڵم، تۆیت
بێ ئەوەی هیچ بڵێت خۆی بە ژیانمدا دەکات
دیوار
گەمارۆم دەدات
هێرشم دەکاتە سەر!
خۆرم لێ زەوت دەکات و زریوەی چۆلەکەش
ئەو لە مندایە
قەڵاکانی لەسەر من دروست کردووە
بناغەکەی دڵمە و لە ڕۆچووندایە
دەبینە هاوڕێ
من و دیوار
ڕەنگ دەخەمە سەر زبرێتیی ژیانی
منداڵیم وێنا دەکەم
لە ڕاکردن بەدووی کۆلارەکەمدا
خودا دەهێنمە تابلۆیەکمەوە و ڕەنگی ناکەم
وێنەی ئەو ساتەی وەزیفەی دیوار دەگۆڕم بۆ دڵی تۆ و
خۆم وەك شاعیر دەبمە وێنەکێش، دەکێشم
لەسەر دیوارەکە ڕۆحم جێ دەهێڵم،
وەختێك چلورەی کردووە و





تۆ لە خاوەنەکەی دەپرسیت:

پلەی "گەرما"ت چەندە؟!

***

ڕۆژێك لەسەر زەوی دەکەومە خوارەوە و

هێزی کێشکردن دەستێکی یارمەتیم ناداتێ

نۆبەرەی سێوم نەکرد و لە ئاسمانەوە فڕێ درامە نێو بۆشایی

شەکەت بووم

ماندووم دەکەن

ئازار دەدرێـم

دەبوو لێرە نەبام...

وەك بودایەك دەڕۆم و لە شوێنێك ڕووناك دەبمەوە

وەك مەسیح شارەکەم جێ دەهێڵم و

بڕوا بە هەموان دەهێنم کە تۆ لە مندای

بە گوێی زاهیدێکدا دەچرپێنم:

"گوو بە هێڵی سەر نەخشەکان

زەوی نیشتیمانمە، بەگشتی"

بەڵام ئەم شارە

بە نەفرەت دەکەم

لەسەر زەوی ژیان دەکەم و

هەڵمژینی هەوایەك لەسەر مانگ، بێهۆشم دەکات

بۆ بینینی خڕێتیی زەوی
دەبێت لە دوورەوە نیگای بکەم
دیوار بە ئەمەکەوە پێی گوتم:
"بەرسڤەکانی مرۆڤ نەرمتر نین لە ئەتۆم
گەرمتر نین لە ئەو
ئاوریشم نین و لە منن"
(سوپاس دیوار)
***
مرۆڤ بۆ من کوشندەیە
وەك کوشندەیی هەوا بۆ ماسی
وەك گۆرانیوتنەکانم، بە پێکراوی
وەك ئەو ساتەی لێرە نیت و
هەپروون دەبم
وەك ئەو ساتەی تۆ لێرەیت و
من
هەر تەنیام...
ئازارێك دەمخاتە پێکەنین
برینێکی قووڵ
سارێژبوونم بیر دەخاتەوە
پیتەکان ساکینی ئەم ئازارەن



ڕستەیەك بە خۆمدا دەدەم
تا مردن لە باوەشی وشەکاندا بێدەنگ دەبم
هیچ هەواڵێکم مەدەنێ
پێشبینیی گشت شتێك دەکەم
بڕیارم داوە نیشانەی سەرسووڕمان بەکار نەهێنم
دڵم پێم دەڵێت زەوی بەرەو کوێ خلۆر دەبێتەوە،
ئاسمان پێم دەڵێت چەند جار ورد کراوە، دڵم
خودا پێم دەڵێت مەودای من و تۆ چەند فەرسەخ لەیەکەوە دوورە



# باڵندەی موسافیر

## مەحمود نەجمەدین

لە چەقی بێئومێدییەوە
سڵاو لە تۆ
ئەی باڵندەی موسافیر
تۆ بەو گەرووە تەنگ و بچووکەوە
چ مۆسیقایەك دەژەنی
تۆ فلووتی ئاسوودەیی
من مۆسیقای دڵێكی تاریك





تۆ مۆزارتێکی سپی و
من مۆزارتێکی ڕەش.
تۆ باڵەفڕە لەسەر ڕۆحی گوڵ دەکەیت
من لەسەر دڕك پەلەقاژێمە
ماڵی تۆ
لە نێوان دوو گەڵادایە
گۆڕی من
لە نێوان دوو مەمکدایە
من
لەبەر چرایەکدا وشە کوژراوەکان
بە فرمێسکی چاوم دەشۆم.
تۆ لەسەر چڵی چنار دەخوێنی
ئەی باڵندەی موسافیر
پێم بڵێ تەمەنی ئەم سەردەمە بێتامە چەند وەرزە؟
پێم بڵێ ڕەعنا چەند سەدەی تر لە خەو هەڵدەستێ؟
پێم بڵێ کەی متمانە بە ڕاوچی دەکەیت؟
پێم بڵێ کەی خەنجەرەکان کول دەبن؟
پێم بڵێ کەی من و تۆ و ڕەعنا و خودا
لەسەر یەك سفرە بۆ نۆشینی شەرابی بەختەوەری کۆ دەبینەوە؟
پێم بڵێ

نهێنیی ئاسمانی تەماویم پێبڵێ،
با وەك درەختی پاییز گەڵاکانی
جوانیم هەڵنەوەرێ.
با وەك دۆزەخ نەسووتێم.
ئەی باڵندەی موسافیر
تۆ باڵەکانت ئاسمان دەپێون
من پێیەکانم لە قوڕولیتەی شارێکدا چەقیون.
تۆ کە ئارەزووت لێنەبێت بۆ خوداش
ئاوازێکت نییە.
من بەبێ ویستی خۆم، گۆشتم لەسەر ئاگردانی
خودایەك دەسووتێ.
تۆ لە ئاسمان عەشق دەکەیت
من لەسەر زەوی
تەنانەت بە دزیی گەڵاکانەوە
عەشق دەکەم.
من لە زەویم و
تۆ لە ئاسمان
با بە یەك ئاڕاستەدا بڕۆین
تۆ بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت ڕێنوێنیم کە
من ئەو ڕاوچییە ڕاو دەکەم کە عەشقکوژە







ئەی باڵندەی موسافیر

وەرە با غولامی مۆسیقا بین

مۆسیقا نەغمەی عەشقە

ئاسمان دێنێتە سەما

مۆسیقا سیحرێکە جەنگ

لە نێو ئاوازەکاندا ون دەکات.

ئەی باڵندەی موسافیر

هاوڕێگەم بە

تا گەردوون

تا ئەوپەڕی سەراب

تا نێوان ددانە برۆنزییەکانی یار

تا نێوان ماچ و گاز

تا سپێتیی حەقیقەت

تا تاریکیی غەم

تا نێو دڵی گیتار.

ئەی باڵندەی موسافیر

من خەمێکم بە کۆڵەوەیە

تا قەرەی قیامەت لێم نابێتەوە.

ڕۆحم نوقمی سەرابە

خەم دەمکوژێ و

ئومێد زیندووم دەکاتەوە
وەك بیابانێکی خنکاو
جگە لە سەربازە بریندار و
ڕێبوارە ونبووەکان، کەسێك بە ناخی مندا گوزەر ناکات.
لە کولبەی درۆیەکدا گەمارۆ دراوم
پێی دەڵێن ژیان.
ئەی باڵندەی موسافیر
تەنیام و عاشقی نادیارم
تەنیام و یاخیم لە کۆڵانەکانی شار
تەنیام و لە قەرەباڵغیدا گەمارۆ دراوم
ئەی باڵندەی موسافیر
ئۆقرە مەگرە لەسەر درەختێك
کە لەودیوی وەرزێکەوە دەمرێ
باڵەکانت پڕ بکە لە هێز و
بەسەر ئۆقیانووسەکاندا بفڕە
ژیان لێرە سووتانە لە نێو درۆیەکی قەشەنگدا
ژیان لێرە
دەریای خوێنە و ویژدان تێیدا خنکاوە
ژیان لێرە
مردنێکە لە ئێوارەیەکدا







لەدایکبوونەوەیەکە لە کازیوەی خەمدا.

ئەی باڵندەی موسافیر

دەنگی دەهۆڵی جەنگاوەرە خوێنخۆرەکان

کەڕی کردین.

پێم بڵێ

چەندی تر بەهاری ئێرە بە ئەندازەی پاییزی

هەسارە ونبووەکان جوان دەبێت؟

ئەی باڵندەی موسافیر

لە گەروومدا ئاوازێك بە زیندوویی نەماوە

هەموو ئاوازەکانیان خنکاند.

وەرە ئەی لە بتهۆڤن خۆشئاوازتر

وەرە ئەی پاگانینییە شێتەکەی ئاسمان

پڕپڕم کە لە مۆسیقا

وەرە،

تۆ دەتوانی ئەتڵەسەکان ببڕی

من هەنگاوەکانم لە کۆڵانەکانی شار دەرناچن

بە ڕۆحێکی سپییەوە

بە کۆڵانی تاریکیی شاردا هەنگاو دەنێم

کۆڵانێك تاریك

وەك پرچی ڕەعنا

کۆڵانێك دەرگاكانی خڕ داخراون
کۆڵانێك تەواوی پەنجەرەکانی پەردەپۆشن
کۆڵانێك ساڵ دوانزە مانگ پاییزێتی
بۆ ساتێك کەسێك نایەتە بەرپەنجەرە
کەسێك ناپرسێ ئەی ئەو ڕێبوارەی
لە ژیان یاخی بوویت،
بۆ کوێ هەنگاو دەنێیت؟
ئەی باڵندەی موسافیر
تیژ بڕۆ
با تیری ڕاوچی نەگاتە سەر دڵت
با باڵەکانت نەسووتێن.
دۆزەخ سەختە
سەختتر ئەوەیە بە دارستانەکانی بەهەشتدا
بە کەلەپچەکراوی بۆ دۆزەخ بتبەن.
ئەی باڵندەی موسافیر
عاشقبوون چەند سەختە
پڕ بووم لە سۆز و ئەوین
پرپرپیان کردم لە حوزن.
ئەی باڵندەی موسافیر
ئەمجارەیان عاشقەکان





خەنجەر لەسەر دڵەکان دەچەقێنن
دڵم لە سۆراغی هێلانەیەکدا ون بوو
ڕۆحم لەژێر پێی پۆستاڵڕەشێکدا تاسا
پێیەکانم بە ڕێگەیەکدا گوزەریان کرد
ئەوسەری تارمایی بوو.
چاوەکانم فرمێسك خنکاندنی
دەستەکانم لە نێوان مەمکی ڕەعنا بەجێمان
سەرتاپام لە گەردەلوولی خەمێکدا نوقم بوو
ئەی باڵندەی موسافیر
تیژ بڕۆ
تیژ بڕۆ
ئێرە دۆزەخە
گیانداری دڵناسك
لەم قەسابخانەیەدا چلۆن دەژی؟
کە بست بە بستی ئاسمانیشی
موڵکی جەللادەکان بن!
لەودیوی مردنەوە
لە پشتی دنیاوە
کولبەیەك هەیە بۆ خەوی ڕەعنا
باخچەیەك

درەختێك
دیوارێك
بۆ نیشتنەوەی باڵە ماندووەکانی تۆ.
ئەی باڵندەی موسافیر
لێرە مۆسیقا دەهۆڵی جەنگە
هاواری ڕۆحێکی بریندارە
لێرە کۆڵان وەك چاوی کوێرێك تاریکە.
لێرە ئایەتەلکورسی خەنجەرە لەسەر
دڵمان چەقیوە.
لێرە بە ژێی کەمانچە مۆسیقا دەخنکێنرێ.
پاگانینی لە نێو ئەم کەڕوکاسانەدا
چەند غەریبە.
ئەی باڵندەی موسافیر
تیژ بڕۆ
با دەنووکت نەشکێنن
مۆسیقای گەرووی تۆ وەڕسکەرە بە گوێی عەوامێك
کە عەشقی خوێن و جەنگن.
بڕۆ
گوێ لە ئاوازێك مەگرە
کە خەنجەربەدەستێك ژێیەکانی





گیتار ئازار دەدا
بڕۆ
زوو بڕۆ
تیژ بڕۆ
با وەکو من لە خەونی ڕەعنایەکدا
ون نەبی.
بڕۆ
تیژ بڕۆ
لە مەملەکەتێکدا مەژی
کە منداڵێك تێیدا بە خەونی نانێکەوە
سەر دەنێتەوە.
لەسەر چڵی درەختێك مەنیشەرەوە
کە پەتی سێدارەی دڵێکی پێوە هەڵواسراوە.
ئەوەندە بەسەر ڕۆحی ڕووبارەکاندا مەیە و مەچۆ
چاوەڕوانی گەمەی ماسییەك مەکە
لەسەر ئاگردانی کۆشکی خوداکان
بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونی جەللادێك دەبرژێ.
بڕۆ
لێرە دڵ هەمیشە قەڵغانە بۆ تیری جەللادەکان.
لێرە پەنجەکان مۆسیقا دەخنکێنن.

لێرە گەرووی کانییەکان خوێنی لێ
هەڵدەقوڵێ.
لێرە موشەکەکانی جەنگ
منداڵێکی بە حەزی پاسکیلەوە کوشت.
کچێکی بە خەونی ژوانێکەوە کوشت.
لە دەمی کۆڵانێکدا لەودیوی پەرژینێکەوە
ژنێکی لەسەر بەرماڵی ئاشتبوونەوە کوشت.
ئەی باڵندەی موسافیر
بە زەمەنی هەسارەی عەشق
سەدەیەکە
لە بەردەرگای کلۆمدراوی ماڵی
ڕەعنایەکدا
ئەشک ئەڕێژم
وەنەوز دەدەم و خەیاڵ دەمباتەوە
شەمەندەفەری خەیاڵ
لە پاییزێکەوە بۆ پاییزێکی تر دەمباتەوە.
لێرە
مۆسیقا لە دەنگی موشەکەکاندا خنکا.
ڕەعنا لە پاییزێکدا بۆ هەمیشە
پەنجەرەی داخست.







لە گەڕەکی جەللادەکان گۆشتی منداڵانی بێلانە
دەبەخشرێتەوە.
مەمکی کچە بێنازەکان
سەرینی جەللادەکانە.
تیژ بڕۆ
لە نێو ئەم تەمومژەدا مەفڕە.
بەسەر ئاسمانێکدا مەفڕە
کە سوور سووره بە خوێنی ئەو دڵە پاکانەی بە ناحەق دوولەت کران.
باڵندەی موسافیر
بە لای گشت دارچنارەکاندا گوزەرم کرد و نەیانهێشت
لێوم بەر ڕوومەتی گەڵایەك بکەوێ
ئای دارچنارەکان
گشت تەمەنی من ڕوانینە لە ئێوە
جوانییەك و ئازارێك و جادوویەك
لە هەموو دارچنارەکاندا دەبینم.
باڵندەی موسافیر
بڕۆ
لەسەر چڵی دارچنارەکان مەنیشەرەوە
باوەکو من جادووت لێنەکەن
نەتکەن بە هەڵم.

تیژ بڕۆ
بە ناو ئاسمانێکدا مەفڕە
کە من و ڕەعنا و دارچنارەکان
لەژێریدا لەم پاییز بۆ ئەو پاییز
زەمەن دەکوژین.
باڵندەی موسافیر
دڵم لە زەردەپەڕێکدا سووتا و
لە کازیوەیەکدا خۆڵەمێشەکەی
بەسەر دارچنارەکاندا باری
ڕەعنا لەو کاتەدا
لەژێر چەترێکەوە
هێدی هێدی بۆ ژوانگەی دڵێکی دی دەچوو.
دایکم لە پاش هەڵوەرینی پانزەهەمین جاری
گەڵاکانی درەختەوە
لە نێو بێدەنگیدا گەمارۆ درابوو
کەچی ئەو کازیوەیە
بۆ سووتانم
دەنگی لایلایەی گشت
درەختەکانی غەمگین کرد.
برۆ تیژ بڕۆ







ئێرە ماڵی حوزنە
کازیوەیەک ئومێدێکی چکۆلەم بوو بە خۆڵەمێش
کازیوەیەک دایکم بەبێ ویستی خۆی بەجێی هێشتم
کازیوەیەک ڕەعنام لێ ون بوو
کازیوەیەک دارچنارەکانی خەیاڵمیان
بڕییەوە.
کازیوەیەک دڵم وەک سێوێک لەت کرا.
ئەی باڵندەی موسافیر
کۆڵان بارانە
ژنێک بە کراسی ئاوییەوە
لەژێر باراندا هەنگاو دەنێ و
لە درەخت دەڕوانێ و دەڵێ
منیش وەک تۆ ڕووتوڕەجاڵم
باران تەڕم دەکات و
دڵی سیسبووم ڕەشەبای زوڵم
بە کۆڵانەکاندا دەیبا و دەیهێنێت.
من
لە بەڵەکۆنەی خەیاڵێکەوە
گۆرانیم بۆ ڕێحانە دەگوت
دایکم لەودیوی کاتژمێرەکانەوە بە خودای گوت

بۆچی ملی من
تاڵەدەزوویەك بێت لە بەردەم چەقۆدا.
باران دەبارێ
کۆڵان ڕێگەیەکی خوساو بوو.
کۆتاییەکەی سەرەتایەك بوو
کۆڵان لەژێر نمەنمەی باراندا بوو
من لە یادەوەریی دارچنارێکدا
بە لای گشت دارچنارەکاندا گوزەرم کرد
ئەوە من بووم هەلاهەلایان کردم
کە گریام چاویان دەرهێنام
کە عاشق بووم دڵیان دەرهێنام
کە بە ئاسماندا فڕیم باڵیان شکاندم
کە گۆرانیم گوت زاریان قرتاندم
کە گوێم لە مۆسیقا گرت کەڕوکاسیان کردم
کە لێوم بۆ ماچێك برد
کردیان بە کانیی خوێن
کە دارچنارێکم خۆش ویست
بە باڵایدا هەڵیانواسیم.
باڵندەی موسافیر
بڕۆ بڕۆ







ئەم زەلکاوە بەجێ بهێڵە
تا باڵیان نەشکاندووی
بفڕە بۆ گوڵستانێك دوور لێرە
تا چاویان دەرنەهێناوی
بڕۆ لەو دیوی ئاسمانەوە
لە ئەستێرەکان بڕوانە
بڕۆ تا کەڕوکاسیان نەکردووی
گوێ لە سەمفۆنیای هەورەتریشقە بگرە
بڕۆ تا زمانیان نەبڕیوی
ستران بۆ مانگ بڵێ
بڕۆ
تا دەنووکیان نەشکاندووی
دەنووك لە دەنووکی مەعشوقەکەی خۆت بدە
بڕۆ
بڕۆ بڕۆ
تیژ بڕۆ
باڵندەی موسافیر
با نەبی بە خۆڵەمێش
ئێرە دۆزەخە.



میران ئەبراهام

ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل

فەرهاد موستەفا

توانا ئەمین

جاك لەندەن

# ڕۆژی ڕەشنووس

**میران ئەبراهام**

سەرەتای مانگی چواری **2014** لە پاشکۆی گۆڤاری "کتێب"دا ڕیکلامێکم خوێندەوە، نووسرابوو: (ڕۆژی **20/4/2014** بۆ جاری پێنجەم لە هۆڵی "خراخت"ی شاری ئەمستردام فێستیڤاڵی ڕۆژی ڕەشنووس بەڕێوە دەچێت).
پاشان لەسەر نێت سەردانی ماڵپەڕی ئەو چاپخانانە و فێستیڤاڵی ڕەشنووسم کرد، کە بۆ جاری یەکەمم بوو ناوی ئەو فێستیڤاڵ و چاپخانانە ببیستم.
ماڵپەڕی ڕەشنووس، کە گۆڤارەکەیش هەڵگری هەمان ناو و ناونیشان بوو، لەو دەمەدا لە ڕێگەی ماڵپەڕی ناوبراوەوە ژمارەیەکم لە گۆڤاری ڕەشنووس داوا



کرد، ئەوەی من لە ڕێگەی ئەو ماڵپەڕ و گۆڤارەوە لام ڕوون بوویەوە و لە مەبەستی فێستیڤاڵی "ڕۆژی ڕەشنووس" تێگەیشتم، ئەمە بوو: لە وڵاتی هۆڵەندادا لە ساڵێکدا زیاتر لە دوو تا سێ هەزار کتێب دەنووسرێن، بەڵام تەنها دووسەد و پەنجا تاکو سێسەد کتێب بەختیان بەردەکەوێت و چاپ دەکرێن و ژمارەی سپاردنیان پێدەدرێت. یانی ساڵانە زیاتر لە دووهەزار ڕەشنووس بێبەخت دەبن و دەکەونە پەراوێزەوە. هەموو هەوڵ و کار و چالاکیی ئەو دوو چاپخانەیە بۆ ئەوەیە... بەختی دووەم بدەن بەو ڕەشنووسە بێبەختکراوانەی کە لە لایەن چاپخانەکانەوە پەسەند نەکراون... هەروەها ئەو ڕەشنووسانەیش کە نووسەرەکانیان لە خۆیان ڕانەبینیوە بۆ چاپخانەکانیان بنێرن.
ئەم بیرۆکەیە زۆر سەرنجی ڕاکێشام، بڕیارم دا لە بیستی مانگی چواری ساڵی دووهەزار و چواردەدا لە هۆڵی خراخت لە شاری ئەمستردام ئامادە بم بۆ فێستیڤاڵی ڕۆژی ڕەشنووس.
لە ڕێگەی ماڵپەڕی "کتێب"وە بانگهێشتی کەسێکم بە ناوی "فرانك فان دام" خوێندەوە، کە لە دێیەکی بچووك لە نێزیك شارەکەی من دەژیا و بە دووی هاورێیەکدا دەگەڕا تاکو لەگەڵیدا لە باکووری هۆڵەنداوە بۆ شاری ئەمستردام هاوەڵیی بکات بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵی ڕۆژی ڕەشنووسدا. فرسەتم هێنا و وەڵامێکم بۆ نووسی، دوای گۆڕینەوەی چەند کورتەتێکستێك، ڕێك کەوتین لەسەر ئەوەی ڕۆژی بیستی ئەو مانگە کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی لە وێستگەی شەمەندەفەری شاری گرۆنینگن چاوەڕوانی یەك بکەین.

ڕۆژی ڕەشنووس
کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی گەیشتمە وێسگەی شاری خرۆنیگن، لە هۆڵی چاوەڕوانی هەر لە دوورەوە سەر و هەیکەلی فرانك فان دامم ناسییەوە، کە پێشتر تەنها چەند وێنەیەکیم لەسەر نێت دیبوون، کابرایەك باڵای دوو مەترێك درێژ دەبوو، تەمەنی لە سەروو شەست ساڵەوە بوو، عەینەکلەچاوێکی سوورکاری ڕەقەڵە بوو. فرانك هەر لە ڕێوە پێشوازییەکی گەرمی لێکردم، وەکو هەموو تەمەنمان هاورێ و دۆستی یەکتر بووبێتین، سەرەتا باسی شتێکی ئەوتۆمان نەکرد، کە لێرەدا شایەنی نووسینەوە بێت.
پاشان گەیشتینە ناو ئەو شەمەندەفەرەی کە ڕاستەوخۆ بۆ شاری ئەمستردام دەچوو، لە تەنیشت یەکەوە جێگەمان گرت.
لە سەرەتاوە بەبێ ئەوەی من هیچ بڵێم و هیچ پرسیارێك لە فرانك بکەم... ڕووی تێکردم و لەبەر خۆیەوە گوتی:








- "من زیاتر لە پەنجا ساڵە دەنووسم، شەست ساڵیشە بە بەردەوامی دەخوێنمەوە!" لە کاتێکدا فرانك ئەمەی گوت، کە لە پەسا قومی لە کۆفییەکەی دەدا و شەمەندەفەرەکەش کەوتە جوڵە و بەڕێ کەوت، منیش لە جێگەی خۆمەوە بە سەرسووڕمانێکەوە لێم ڕوانی و سەرێکم بۆ ڕاوەشاند.
لە کاتیکدا من لە خەیاڵمدا لە وەڵامێکی شیاو دەگەڕام تاکو وەڵامی فرانك بدەمەوە، ئەو ڕووی لە من وەرگێڕا و ڕووی کردە ئەو ئافرەتەی کە بەرانبەرمان دانیشتبوو، ئەوەندە بە دیقەتەوە لێی دەڕوانی، ئاگای لای من نەما، منیش نەمویست لەو سەرنجدان و خەیاڵەی دای ببرم، ئافرەتێکی ڕێکپۆشی پرچزەردی چاوگەش و شین، دەمبەپێکەنین و ڕووخۆش... بەردەوام دەستی بە خۆیدا دەهێنا و بەملاولادا دەیڕوانی، تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبوو، لەو ئافرەتانە بوو کە تاکو دەچنە تەمەنەوە، شێوازی ڕوخساری لاوێتییان ون ناکەن و پیری بە ئەستەم زەفەریان پێدەبات، زۆری پێنەچوو پێکەوە کەوتنە قسە و قاقالێدان، لێدوانەکانیان زۆربەی بەو دیالێکتە بوون، کە باکووری هۆڵەندا لە ناو خۆیاندا پێی دەدوێن، ئەوەندی من لێیان تێگەیشتبێتم، ئەوە بوو کە فرانك بەردەوام وەك نووسەر خۆی ناوزەد دەکرد و ئافرەتەکەش بەردەوام ئەوەی دەگوتەوە، کە خۆی بە بەختدار دەزانێت ڕێکەوتی نووسەرێکی کردووە.
کاتێك ئەوان لە گەرمەی لێدواندا بوون، من لە ناچاریمدا لە پەنجەرەی فارگۆنی شەمەندەفەرەکەوە بێدەنگ لە دەرەوەم دەڕوانی، لەو پارچە زەوییە سەوز و پارچەپارچانەی کە دەکەوتنە نێوان ماڵی جوتیارەکانەوە، کە یەك یەك و بە کۆمەڵ خێرا بە پێشچاومدا گوزەریان دەکرد... یان باشترە بڵێم شەمەندەفەرەکە خێرا بە لایاندا تێدەپەڕی.
نازانم لە خەیاڵمدا لە چ پارچەیەك یان سەرەداوێك دەگەڕام لە ڕابردوومدا... ئەوەندەی بە بیرم بێت، هێشتا لە دەرگای هیچ سات و کاتێکم نەدابوون، دەستێك بەر ڕانم کەوت و لە خەیاڵمیان دابڕیم، کاتێك ڕوانیم... ئافرەتەکە ڕووی لە من بوو و لێی پرسیم:
- "ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟" لە کاتێکدا ئەمەی گوت، کە بە ناز و مەکرەوە قووڵ لە چاوەکانمی دەڕوانین، منیش پاش تاوێك سەرنجدانی لە وەڵامدا گوتم:

ـ "خرۆنیگن"
ـ "نا، نا، پێشتر مەبەستمە؟!" پاش تاوێك بیرکردنەوە و ڕوانین لە لێوە سوورەکانی کە لە پەسا بە زمانی تەڕی دەکردنەوە، گوتم:
ـ "ئەمستردام"
ـ "نەخێر... بە ڕەگەز مەبەستمە!؟"
ـ "هۆڵەندا"
ـ "گرانی مەکە لێم... بە ڕەنگتا دیارە کە تۆ بە ڕەچەڵەك هۆڵەندی نیت!؟"
ـ "نازانم، پێویستە تۆ ئەو پرسیارە لە باوکم بکەیت!"
ـ "یانی خۆت بە لاتەوە گرنگ نەبووە و تا ئەم تەمەنەیشت ئەو پرسیارەت لە کەسوکارت نەکردووە؟"
ـ "نەخێر... ئەوەندی ئێستا بزانم، من هەڵگری ڕەگەزنامەی هۆڵەندیم، ئەوەندەم بەسە و بەوە ڕازیم".
ـ "ئەوەندی من بە شێوازتا دەیبینم، تۆ لە تورك یان فارس دەچیت، یان... تۆ یاری بە ئەقڵی من دەکەیت؟!"
ـ "زۆر باشی بۆ چوویت!"
ـ "بەڕێز، تۆ وەڵامەکانت لە تووڕەیتەوە سەرچاوەیان گرتووە، یانی مەبەستت ئەوەیە کە... یاری بە ئەقڵم دەکەیت، ئەزانی چی بەڕێز... دایمە هەمان بالۆرەیە لەگەڵ ئێوەی بێگانەدا". لە کاتێکدا کە هێشتا بە تووڕەییەوە لێی دەڕوانیم و لەوەدا بوو زیاتر لەسەری بڕوات، من ڕووم لێ وەرگێڕا و دیسان لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەم دەڕوانی، لەو کاتەدا شەمەندەفەرەکە لاشەی درێژ و گرانی خۆی بە جیڕەجیڕ و ناڵەناڵ کێشایە ناو چەندین ماڵ و ئاپارتمانی شارێکەوە... شاری (ئاسن) کە بیست کیلۆمەترێك لە شاری خرۆنیگنەوە دوورە، لە وەستانی شەمەندەفەرەکەدا ڕوانیم، ئافرەتەکە... هەنووکە لەبەر خۆیەوە دەی بۆڵاند و بە تووڕەییەوە خۆی کۆ کردەوە و بەبێ ئەوەی ماڵئاوایی نەك لە من، لە فرانکیش بکات، لەو وێستگەیە دابەزی.



کاتێك شەمەندەفەرەکە کەوتەوە ڕێ، پاش تاوێك بێدەنگی، فرانك لەبەر خۆیەوە پێی گوتم:
ـ "دیارە خراپ نووستوویت؟"
ـ "وابزانم"
ـ "ئەڵێم، بەڕێز... بە موجامەلە نەبێت و بە دەردی ئەو ئافرەتەم لێ بەسەر نەیەت،



تۆ لە هۆڵەندا لە دایك بوویت؟"

- "نەخێر".

- "ئەی لە کوێ لە دایك بوویت؟"

- "لە جێگەیەك لەسەر ئەم زەوییە!"

- "بمبوورە، دیارە ناتەوێت لەو بارەیەوە بدوێیت؟"

- "نەخێر".

- "بۆچی؟"

- "تۆ و هاوڕەگەزەکانی تۆ لەم وڵاتەدا... پێویستە فێر بن لە پێش هەموو شتێکدا ئەو پرسیارە نەکەن، خەڵکی کوێیت، خەڵکی کوێیت؟ نەخێر... لە یەکەم نیگادا پێویستە ئەو کەسە وەك مرۆڤ قبووڵ بکەن، پێش ئەوەی بزانن خەڵکی کوێیە و بە ڕەگەز کوێییە، یان هەڵگری چ پرەنسیپ و ئایدۆلۆژییەکە، بۆ زانینت، من ڕۆژانە بەردەوام ئەو پرسیارەم لێدەکرێت".

- "جا ئەوە ئاساییە!"

- "پێدەچێت بە لای ئێوەوە ئاسایی بێت، بەڵام بە لای منەوە گرانە، دەشتوانم بڵێم ڕەوشتیکی نامرۆڤانەیە".

- "ئاخ... ئەوەندی گران مەکە لەسەر ڕۆحی خۆت!"

- "من خۆم هەزاران جار ڕێکەوتی ئەوەم کردووە کە مرۆکان لێرە... ئامادە نین تەوقەت لەگەڵ بکەن و بکەونە لێدوان لەگەڵتا، تاکو نەزانن بە ڕەگەز کوێییت، ئەوەیش کێشە نییە، کێشەکە لەوەدایە کە گوتت خەڵکی فلان یان فیسارە وڵاتم، بێبەختییەکە لێرەدایە... بۆ هەموو بێگانەیەك یان خەڵکی هەموو وڵاتێك، پێشوەخت پەیکەرێك لە خەیاڵی هەموو هۆڵەندییەکدا داتاشراوە، ئیتر من و ئاستی ڕۆشنبیریی من و کەسایەتیی من هیچ دەورێکیان نامێنێت".

- "لەوەیاندا لەگەڵتام".

- "سوپاست دەکەم، زۆر جار دێمە سەر ئەو باوەڕەی کە کولتوور و ڕەوشتی نازییەکان هێشتا هێزی ماوە بەسەر ڕۆحی خەڵکی ئەم وڵاتەوە، جا بۆ ئەوەی ئەو کێشەیە لەم وڵاتەدا چارەسەر بکەین، پێویستە بێگانەکان ئیشارەتێك

یان مۆرێکیان لێبدرێت تاکو لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکاندا ئاسان بناسرێنەوە. مەبەستم، هەروەکو چۆن نازییەکان لە جەنگی جیهانیی دووەمدا بۆ جیاکردنەوە و ناسینەوەیان ئەستێرەیەکیان دابوو لە سنگی هەموو جوولەکەیەك لەم وڵاتەدا... بۆ نا، ئەوکات ئێمە و ئێوەیش لەو سەرئێشەیە ڕزگارمان دەبێت!"

ـ "نا نا، تکات لێدەکەم مەیگەیەنەرە ئەو ئاستە، پێم وابێت... ئەو خانمە لە بیری بردینەوە بۆچی ئەمڕۆ من و تۆ پێکەوەین و بۆ چ مەبەستێك بە ڕێوەین بۆ ئەمستردام، تۆ بڵێیت جادووی جوانییەکەی بووبێت یان... تۆ کەمێك ئێرەییت بە من برد، کاتێك من لە لێدواندا بووم لەگەڵی؟"

ـ "هەرچییەك بووبێت، ئەو خەیاڵی شیواندین".

ـ "من پێشتر ئەوەم پێگوتیت کە پەنجا ساڵە دەنووسم و هەموو ژیانم بۆ نووسین تەرخان کردووە، باوەڕ بکە بە درێژایی ئەو تەمەنە زۆرەم، بەردەوام لە لایەن ئافرەتانەوە خەیاڵم داگیرکراو و شێوێندراوە. هۆکارەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەستانە سێکسییەی کە لەسەر ڕۆحم دروست بووە. لە تەمەنی **24** ساڵیمدا ڕێکەوتی ئافرەتم کرد، نەك تەنها پەیوەندیی ڕۆحی، بەڵکو جەستەییش، ئەوە چاڵێکی قووڵی ڕەشە لە هزر و ڕۆحی مندا و نە ڕۆشن دەبێتەوە و نە بۆشم پڕ دەبێتەوە". فرانك، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چەند جارێك لەپی هەردوو دەستەکانی بە دەموچاویدا هێنان، پاشان بە بێزارییەکەوە دەستی کرد بە هەڵگلۆفینی دەستەکانی لە یەکتری. نازانم لەو کاتەدا ویستم چی بە فرانك بڵێم، کاتێك ئەو بەردەوام بوو گوتی:

ـ "لێت ناشارمەوە، تاکو ئەمڕۆ نەك تەنها کتێبێك چییە، بە چاپم نەگەیاندووە، بەڵکو لە هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێکیشدا نووسینم بڵاو نەکردووەتەوە".

ـ "هۆکار چییە؟"

ـ "بڵێم چی، یەکەم... باوەڕبەخۆنەبوونم، دووەم... ڕەشبینیم بەرانبەر بە ژیان و بێهیوابوونم لە مرۆڤ بەگشتی، ئەوانە وام لێدەکەن کە بەردەوام ئەو پرسیارە لە خۆم بکەم... ئایا من بۆچی دەنووسم؟"



ـ "یانی خواست و خەونت نەبووە نووسینەکانت بڵاو بکەیتەوە و لەگەڵ خەڵکیدا بەشیان بکەیت؟"

ـ "خۆشم نازانم... بەڵێ... هەردەم خەونم بووە، دایم خەمبارم بەوەی کە هێزی ئەوەم تێدا نەبووە نووسینەکانم بڵاو بکەمەوە. لە ڕاستیدا کاتێك ئێمە بەرهەمی خەیاڵمان دەنووسینەوە، لەبەر ئەوە دەینووسین، کە کەسی دووەم و سێهەم و



هەموان بیبینن، ئەگینا بۆ دەینووسین و بۆچی کۆپیی بیر و فیکر و بەرهەمی خەیاڵی خۆمان دەکەین".

ـ "لە چ بوارێکدا دەنووسیت؟"

ـ "تاکو ئێستام... دە ڕۆمان و زیاتر لە سەد کورتە چیرۆکم نووسیون، هەردەم مۆراڵ لای من زۆر گرنگ بووە... سیاسەت... ئەوە خۆمی زۆر لێدەپارێزم و نایەڵم بۆنوبەرامی تێکەڵی هەوای ئەو جیهانە ببێت، کە من لە ڕۆمانەکانمدا دەیانخوڵقێنم، من خۆم لە دێیەکی بچوکی چوار ماڵیدا گەورە بووم و تاکو ئەمڕۆیش لەوێ دەژیم، کەراکتەر و پلۆتی ڕووداوەکانم هەردەم نمایشی ژیان و ڕووداوگەلێکی مرۆڤی هاوشێوەی خۆم دەکەن، هەڵبەتە دایم بەو مەبەستە نووسیومە، بە تایبەتی بۆ ئەو چین و توێژەی ناو کۆمەڵگەی هۆڵەندا، هەر بۆیە خۆم لە قسەی زل و فەلسەفەلێدان و وتارخوێنی پاراستووە... چونکە گێڕەرەوە لە گێڕانەوە دادەبڕێ و زۆر جار بەبێ ئەوەی نووسەر هەستی پێبکات، خەیاڵی خوێنەری دەشێوێنێ".

ـ "یانی تۆ... بە ئاگاییەوە بۆ چین و توێژێکی تایبەت دەنووسیت؟"

ـ "من لە ڕۆمانەکانمدا بەردەوام کار لەسەر مۆراڵ دەکەم... کەواتە گرنگە بزانم چ چین و توێژێکی ناو ئەم کۆمەڵگەیە دەدوێنم".

ـ "نازانم... مۆراڵ لای من مانایەکی ئەبستراکتی هەیە و بە ئونێڤێرساڵ دەیبینم بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، بەتایبەتی لە هونەردا بە هەموو فۆرمەکانیەوە... هونەری ڕۆماننووسین هەردەم تایبەتمەندیی خۆی هەیە، هەر بۆیە ناتوانم هەر چین و توێژ و کۆمەڵگەیە و جۆرێك لە مۆراڵی سەربەخۆیان پێببەخشم، هەڵبەتە بێجگە لەو مرۆڤانەی کە ئایدیۆلۆژی ڕێگرە لە پێشیان بۆ بەمرۆڤبوونیان و جۆرێك لە مۆراڵی ستانداردیان پێبڕاوە".

لەم کاتەدا جوڵە و دەنگەدەنگ کەوتە ناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکەوە، تەماشام کرد دوو جابی لەوسەری فارگۆنەکە بەرانبەر ئێمە وەستابوون، یەك یەك بەسەر سەرنشینەکاندا دەگەڕان و تەماشای پسووڵەی مۆڵەتی سەفەرەکانیان دەکردن، ئێمەیش بێدەنگەمان لێکرد تاکو جابییەکان تەماشای پسووڵەکانی ئێمەشیان کرد، لە دوای ئەمەوە فرانك بێدەنگەی لێکرد و سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردبووەوە، منیش لە خەیاڵمدا سەرقاڵی تاوتوێکردنی قسەکانی پێشوومان بووم، لە پڕێکدا فرانك وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، ئەو بێدەنگییەی شکاند

و لەبەر خۆیەوە و بە ئەسپایی، وەکو نەیەوێت سەرنشینەکانی ناو ئەو فارگۆنە گوێیان لێی بێت، خۆی لێ نێزیك کردمەوە و پێی گوتم:

- "ئەزانیت، ئەم میراتییەم لە باوکی نارەحمەتیمەوە بۆ بەجێ ماوە؟!"

- "کام میراتی؟"

- "نووسین، نووسین و خەونی نووسەربوونم مەبەستە؟"

- "بۆ، باوکت نووسەر بوو؟"

- "نووسەر، نووسەر... بەڵێ، هەرچەند من باوەڕم بەوە نییە کە نووسین و بەهرەی نووسین بۆماوە بێت، لە سەدا هەزار دڵنیام کە بەهرەیەکی سروشتییە و دەبێت لەگەڵتا لەدایك بوویێت!"

- "ڕێژەیەکی کەمی هەموو مرۆیەك لە ئەزەلەوە هەڵگری جۆرێك لە بەهرەیە، ئەوەیش ئەرکی خانەوادە و کەسانی چواردەورییەتی تێیدا وەدۆزن و بیورووژێنن، تا لە بوارێکدا گەشەی تێدا دەکات".

- "باوکم، گوایا باوکم نووسەر بوو یان نا، باوکم **40** ساڵ بۆ ڕۆژنامەی (پەڕەی ڕۆژی باکوور) کاری هەڵەچنیی دەکرد. ئەوەندەی من بزانم، بە هەمان شێوەی من هەنووکە خەون و خەیاڵی هەردەم لای بەنووسەربوون و نووسین بوون، لە ژیانیدا یەك کتێبی شیعری چاپ و بڵاو کردەوە، بەو هۆیەشەوە بە هەموو تەمەنی خۆی وەکو نووسەر لە قەڵەم دەدا و شانازیی پێوە دەکرد. تاکو مردیش، بەردەوام کتێبەکەی لە بەرباخەڵیدا بوو. باش بە بیرم دێت کاتێك مناڵ بووم، تازە ئەو دیوانەی بە چاپ گەیاندبوو، کە چل کورتە شیعرێکی لەخۆ دەگرت، ئەو شیعرانەی هەموو بە من و خوشك و براکانم و دایکم ڕەوان کردبوون، تاکو ئەمڕۆیش هەموویانم لە بیر ماون و ڕۆژانە لەبەر خۆمەوە دەیانلێمەوە، باوەڕم پێبکە لە ماڵەکەی ئێمەدا ئەو کتێبەی باوکم جێگەی کتێبی ئینجیلی پیرۆزی گرتبووەوە. لە دوای ئەو ڕۆژانەوە هەردەم باوکم لە پلانی ئەوەدا بوو کە کتێبی دووەم و سێهەمی بنووسێت، بەڵام هەر بۆی ڕێك نەکەوت. سی ساڵێك پێش ئەمڕۆ کۆچی دوایی کرد، لە سەرەمەرگیدا بە جیا لە برا و خوشکەکانم بانگی منی کرد و چپاندی بە گوێمدا: "کوڕم هەوڵ بدە بنووسە و ببە بە نووسەر، تۆ بەهرەداریت و تۆ تەنها مناڵمیت کە ئەو بەهرەیەت لە منەوە بۆ بەجێ ماوە... ئەوە سەروەتە و لە دەستی خۆتی نەدەیت".



- "ئاوا... ئێستا لێت تێگەیشتم!"

- "ئەم میراتییەی باوکم کە لە ناو برا و خوشکەکانمدا تەنها بە منی ڕەوا بینی و بە





من برِا، لە ژیانمدا زیاتر زەرەری لێدام لە قازانج، برا و خوشکەکانم جیاواز لە من هەموو ژیانی ئاسایی خۆیان بەسەر دەبەن و ئاسوودەن، ئێستا من هەردەم ئێرەیی بەوان دەبەم، بریا هەر لە سەرەتاوە خووم بەم نووسینەوە نەگرتایە، بەڵام تازە هەموو رۆحی تەنیوم و من بووم بە پاچەیەك لە نووسین و خەیاڵی نووسین".

ـ "بۆچی تۆ هونەری نووسین، یان هونەر بەتایبەتی وەکو رەوشتێکی ئاسایی دەبینیت، کە ئێمە خوومان پێوە گرتبێت؟"

ـ "بۆ ئەو کەسانەی کە بەهرەی نووسینیان نییە و خەیاڵیان سفرە... تەنها خووپێوەگرتنێکە و لاساییکردنەوەی ئەوانی ترە. بێگومان بێبەهرەکان بە بەردەوام لە شەرِیشدان لەگەڵ مەحاڵدا و ئازار دەچێژن، بە دەگمەن لە بواری هونەردا دەتوانن داهێنان بکەن، مەبەستم لە هونەرە بە هەموو فۆرم و شێوازەکانییەوە. مرۆ بێبەهرە و خەیاڵەکان دەتوانن کاری وەرگێرِان و وتاری رۆژ نووسین و لە بوارەکانی ئەنتەرتەینمەنتدا کار بکەن، وەکو تر ئەستەمە لە بواری هونەردا داهێنان بکەن".

ـ "ئەی تۆ خۆت بە بەهرەدار دەزانیت یان...؟"

ـ "تاکو ئێستاش نازانم، هەست دەکەم بیرکردنەوە و خەیاڵی نووسین هەردەم ئازارم دەدەن، دەبێت تەواو خۆم مەست بکەم و هەنووکە دەرزییەك بئاژنم بە رۆحمدا، ئەگین پەی بە خەیاڵم نابەم و ناورووژێم تاکو بنووسم".

ـ "چۆن، چۆن، بە راستتە؟! ئەوە مۆدێل و پرەنسیپی نووسەرانی کلاسیك بوون، خۆمەستکردن و بێهیوایی و سێکسی بەردەوام و پابەندنەبوون بە هیچ یاسا و رێسایەکەوە. هەرچەندە ئێستاش لە ناو هونەرمەندە شێوەکارەکاندا باوە. یانی تۆش بەو چەشنە کردار لەگەڵ رۆحی خۆتدا دەکەیت؟"

ـ "بەڵێ، بە داخەوە... ئەگەر تەواو مەست نەبم و لە حەفتەیەکدا لەگەڵ ئافرەتێك دواندا نەچمە ناو جێگەوە، دەستم قەڵەم ناگرێت و هەست دەکەم لە هەموو شتیك بەتاڵم و بێئارامم و هەست بە ورووژانێکی ئاڵۆز دەکەم لە خۆمدا. بەردەوام وەك ورچی برسی بە ماڵەکەمدا دێم و دەچم. گومانم نییە کە ئەوە نیشانەی بێبەهرەیمە".

لە پاش ئەم لێدوانەی فرانك، کە بە ئەستەم توانیی دواوشەی دەرببرِێت و چاوەکانی پرِ بووبوون لە فرمێسك و

لەوەدا بوون بەر ببنەوە سەر ڕوومەتەکانی، بە دڵتەنگییەکەوە دەستەسرێکی لە گیرفانی چاکەتەکەی دەرهێنا و چاوەکانی پێ وشك کردنەوە. پاشان ڕووی لە من وەرگێرا و بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی و هەردوو دەستی توند لەیەك هەڵدەگلۆفین و تا دەهات، زیاتر دەستەکانی لە نێوان ڕانەکانی توند دەکردن، بینیم چۆن عارەق بە لاجانگەکانیدا دەچۆڕانە خوار، بە جۆرێك، کە من لە تەنیشتییەوە بێدەنگ لێم دەڕوانی و لە خەیاڵی خۆمدا هەستم بە پەشیمانی دەکرد لەو پرسیارانەی کە لێم کردبوو، ئەو دوو کاتژمێرەی لەو شەمەندەفەرەدا لە شانی یەکەوە دانیشتبووین... هەنووکە ئەو قسەکەر و منیش گوێگر بووم، ئەو ڕۆژە تەنانەت فرانك پرسیاری ئەوەیشی لێنەکردم کە ئایا من چ کارەم و چی دەنووسم. تا گەیشتینە بەردەم هۆڵی خراخت، فرانك هیچی تری نەگوت. لە پڕێکدا هەڵسڵەمییەوە و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- "ئەڵێم، کاتمان لە پێشە و با لە جێگەیەك بیرەیەك یان پێکێك شەراب بخۆینەوە".

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند بە مەبەستی ڕازیبوونم و لەبەر خۆمەوە گوتم:

- "پێم باشە".

سەنتەری شاری ئەمستردام... با وا بڵێم "بڕوخێت بەسەر کافتریا و کۆفی شۆپدا دەگیرسێتەوە"، لە کۆفی شۆپێك لامان دا و سەر و بیرەمان داوا کرد، من هێشتا پەرداخی یەکەمم لە ناودەستمدا بوو، کە لە نیوەی زیاتری تێدا مابوو... لە پەنجەرەیەکی گەورەوە کە بەسەر شەقامێکی جەنجاڵدا دەیڕوانی... بێدەنگ لە دەرەوەم دەڕوانی، ئەوەندەی لە بیرم مابێت، من هەنووکە لە هەوڵی ئەوەدا بووم سەری باسێك بکەمەوە و کۆتایی بەو بێدەنگییەی نێوانمان بێنم، بەڵام هیچی وام شك نەدەبرد. ئاگام لێبوو فرانك دوای خێرا هەڵقوڕاندنی چەندین بیرە، شوشەیەك شەرابی داوا کرد و بەبێ ئەوەی فەرمووی من بکات... پێم وابێت هەمووی چارەکێکی پێنەچوو... خێرا خێرا پەرداخەکەی لێ پڕ دەکرد و دەینا بە سەرییەوە؟ لە ناحاڵیبوونم لەو کردارەی ئەو، ئەوجا تەواو ڕووم لێ وەرگێرا و بێدەنگ لە دەرەوەم دەڕوانی، لەناکاو دەستێکی خستە سەرشانم و بە دەنگێکی گڕ گوتی:



- "با بڕۆین، ئێستا من ئامادەم، ئەوە لە بیرم چوو پێت بڵێم، ئەمڕۆ من لە هۆڵی (خراخت) پێنج دەقیقەیەك کاتم پێبڕاوە تاکو وەکو نووسەر خۆم بناسێنم".

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و بەدەم ڕۆیشتنمەوە گوتم:

- "فرسەتیکی باشە".



کاتیك گەیشتینە ناو هۆڵەکە، جێگەی دانیشتن نەمابوو. دیار بوو فێستیڤاڵەکە دەستی پێکردبوو. خێرا بە سەروخواری هۆڵەکەدا ڕوانیم... ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوە بوو کە بە دەگمەن پیاوێکت دەبینی. شەش ئافرەت لەسەر سەکۆی هۆڵەکە بوون و یەك یەك لەسەر ئەزموونی نووسینی خۆیان دەدوان. لەو کاتەدا فرانك ئاوڕێکی لە من دایەوە و لێی پرسیم:

ـ "ئەی تۆ بەتەمای چیت ئەمڕۆ؟"

ـ "هیچ... من ئەمڕۆ تەنها گوێگرم!"

ـ "من دەبێت ئامادە بم، کە گوێم لە ناوی خۆم بوو... بەڵێ، دەبێت ئامادە بم... تەواو ئەمە ڕۆژی منە و ئەوە دەڵێم، کە ڕەشنووسی دە ڕۆمانم ئامادەیە و هەر چاپخانەیەك دەیەوێت، دەتوانێت چاپیان بکات و ڕازیم ئەگەر داهاتێکی زۆر کەمیشم دەست کەوێت. گرنگ ئەوەیە چاپ بکرێن، تەواو... تەواو، هەروا دەڵێم... بێ کەم و زیاد".

لە دوای ئەم لێدوانەی فرانکەوە تاوێك بوو بێدەنگ گوێمان لە چەند ئافرەتێك دەگرت. باسیان لەوە دەکرد، کە چۆن ساڵی پار لە لایەن یەکێك لەو چاپخانانەوە هاوکاری کراون، بۆ جاری یەکەم خەونیان هاتووەتە دی و کتێبیان بۆ چاپ کراوە و ئیستا بە چاپی دووەمییەوە سەرقاڵن، پاشان لە بیری ئەوەدان کە کتێبەکانیان بۆ سەر زمانەکانی ئینگلیزی و فەڕەنسی وەربگێڕن، دوای ئەو نووسەرە ئافرەتانە گەنجێکی ڕێکپۆش تاوێك ڕیکلامی کرد بۆ چاپخانەیەك،

پاشان کچێکی لاوی سوورپۆش هاتە سەر سەکۆکە و گوتی: (داوا لە بەڕێز: فرانك فان دام دەکەم تەشریف بێنێتە ئێرە). من لەو کاتەدا ئاوڕم دایەوە لە لای شانی ڕاستم کە فرانکی لێ وەستابوو... نەمبینی، وتم لەوانەیە بەڕێوە بێت بە ناو ئەو جەنجاڵییەدا بۆ سەر سەکۆی هۆڵەکە.

بەڵام کاتێك چەندین جار کچە سوورپۆشەکە ناوی فرانکی دووبارە و سێبارە کردەوە و فرانك هەر نەگەیشتە سەر سەکۆکە، کەوتمە گومانەوە. بە هەڵەداوان بەرەو هۆڵی چاوەڕوانی و تەوالێتەکان چووم... کاتێك گەڕامەوە، کەسێکی تر لەسەر سەکۆی هۆڵەکە بوو، لە گەرمەی باسی خۆیدا بوو، ئامادەبوان بێدەنگ و بە سەرنجەوە گوێیان لێدەگرت، ویستم منیش وەکو هەموان سەرنج بدەم و گوێی لێبگرم، بەڵام نەمتوانی فرانك فەرامۆش بکەم... لە کاتێکدا کە لە خەیاڵی ئەوەدا بووم بڕیاری ئەوە بدەم و بە خۆم بڵێم: "فرانك بە ڕێگەی خۆی و ئەو کێشەی من

نییە".

بەڵام هەرچەندێکم کرد، نەمتوانی و خێرا لە هۆڵەکە دەرچووم و چوومە سەر شەقامی بەردەمی هۆڵی خراخت، هەستم بە ورووژانی ڕۆحم دەکرد، لەشم عارەقێکی ساردی کردبوو... خۆم گەیاندە ئەو کۆفی شۆپەی کە پێشتر لەگەڵ فرانك لێی دانیشتبووین. کاتێك من بە شڵەژاوییەکەوە لە باڕی کۆفی شۆپەکە نێزیك بوومەوە و بیرەیەکم داوا کرد... باڕمەنەکە هێشتا خەریکی تێکردنی بیرەکە بوو، لەو کاتەدا کەسێك دەستی خستە سەر شانی ڕاستم و گوتی:

ـ "نووسەر بم یان نووسەر نەبم... ئەوەیە مەسەلەکە".

ـ "فرانك... ئەوە چیت لێ بەسەر هات؟"

ـ "واز لەوە بێنە... تۆ ئەگەر شارەزای ئەمستردامیت، تکایە با تاوێك بگەڕێین بەم شارەدا، کە بۆ جاری یەکەممە ڕێم تێی بکەوێت".











فرانسواز ساگان

# ڕۆژباش ئەی غەم

وەرگێڕانی
دلاوەر قەرەداغی

# چیرۆكی دەرسیم

**ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل**

ئەوە ناونیشانی كۆمەڵە چیرۆكێكە، دەزگای بڵاوكراوەی ((مەتیس))ساڵی **2012** بڵاوی كردووەتەوە.
مورادخان مونگان چیرۆكەكانی هەڵبژاردووە و پێشەكیی بۆ نووسیوە.. بیستوچوار چیرۆكنووس تیایدا بەشدارە ـ وەك لە ژیاننامەی نووسەرەكان دەردەكەوێت، چوار لەو چیرۆكنووسانە بە ڕەچەڵەك كوردن. كارەساتی ڕەشەكوژییەكەی دەرسیم لە چیرۆكەكاندا ڕەنگی داوەتەوە...
ئاشكرایە جوڵانەوەی دەرسیم لە مایسی **1937**ز تاكو **1939** بەردەوام بوو. حكومەتی توركیا بە پلانێكی داڕێژراو سوپایەكی بە ناوی "موناوەرە – مانۆڕ"ـەوە بۆ ناوچەكە نارد و دەستی بە قەتڵوعامی دانیشتوانی دەرسیم و دەوروبەرەكەی كرد. بەپێی بەڵگەنامەكان، سەدوپەنجا هەزار ژن و منداڵ و پیریان قەتڵوعام كرد، بەوەشەوە نەوەستان و دارستان و كێڵگە و مەزراكانیان سووتاند، دێكانیان خاپوور كرد، ئەشكەوتەكانیان بە مرۆڤەكانی ناویەوە، كە لە ترسا پەنایان بۆ بردبوو، گڕ تێبەردا، نزیكەی نیو ملیۆن كەسیشیان بە ناو شارە توركنیشنەكاندا پەرت كرد تا زمان و كولتووری خۆیان لە بیر بچێتەوە. ئەم جینۆسایدە قڕوقەپی لێكرا، بەڵگە و دۆكیۆمێنت و فەرمانە سەربازییەكان تا ئێستاش لە ئەرشیفە داخراوەكاندا بە نهێنی ماونەتەوە. بەڵام ئەو كارەساتە هەروا بە ئاسانی لە بیر نەچوو. دەماودەم، نەوە لە دوای نەوە بۆ یەكیان دەگێڕایەوە، هەندێ لە ڕۆشنبیرانی توركی خاوەن ویژدان



دڕندەیی ئەو کارەساتەیان بە خەڵکی گەیاند، بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا هەندێ لە ڕۆشنبیرانی کورد و تورک لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و دەقە ئەدەبییەکانیانەوە ئەو کارەساتە وە بیری نەوەی نوێ دەهێننەوە. تا بەرپرساتی تورکیاش لەم دواییانەدا دانیان بە کارەساتێکی وادا نا...

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە، هەوڵێکە لەو جۆرە دانپێدانانە...

گرنگیی ئەم کتێبە لەوەدایە دوای ساڵانێکی دوورودرێژ لە بێدەنگی و پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی ئەنقەستی ئەو کارەساتە خوێناوییە، کۆمەڵێك لە نووسەرانی تورك ویژدانیان جوڵاوە و ویستوویانە ڕاستییەکان ئاشکرا بکەن، دژی کوشتن ڕابوەستن، هەریەکە و ئەو دیمەنە خوێناوییانەی ئەو ڕۆژانەی دەرسیمیان بە شێوەیەکی هونەری لە چیرۆکەکانیاندا دەربڕیوە و ڕەنگی داوەتەوە. وەکو وەفایەك حەز دەکەم لێرەدا ناویان بهێنم ـ خۆزگە لە فێستیڤاڵەکانی گەلاوێژدا هەندی لەو نووسەرانەیان بانگهێشت دەکرد وەك وەفا و پێزانینێك.

یاڵچین توسان، ئایهان گەجگین، جەمیل قاوقچو، بەهجەت چەلیك، ئایفەر تونج، بورهان سۆینمەز، خەدیجە مەریەم، شولە گوربوز، هەقان گوندای، ئایشە گول چەلیك، حەیدەر قەرەتاش، موراد یاڵچین، کارین قەرەقاشلی، موراد ئویەر، گایە بورالی ئوغلو، سەماقایغی سوێز، یاوز ئەکینجی، سەرای شاهینەر، موراد ئوز یاشار، جاکلین چەلیك، گۆنیل قڵلجم، بارش پیچاقچی...



دەبێ ئەوەش بڵێم، ئەم هەوڵانە بۆ ئەوە نین ڕق و کینە زیندوو بکەینەوە و بدەمێنین، یا تاخمێك بەگژ تاخمێکی دیکەدا بچێ، ئەدەب و هونەر ڕق ناوروژێنن، لایەنگری ئاشتی و ژیانن، بیرەوەری، یادەوەریی زەین نوێ دەکەنەوە، ڕاستییەکان ئاشکرا دەکەن و بەرپرسیارێتی دەخەنە ڕوو. ئەو چیرۆکانەش بۆ دۆستایەتی نووسراون...

ئەوە ئایدیۆلوجیا سەقەتەکانن کاری نامرۆڤانە دەکەن، کوشتن دەکەنە فەرهەنگی خۆیان، ئەوە میللەتی تورك نەبوو دەرسیمییەکانی قەتڵوعام کرد، بیرکردنەوە و ئایدیۆلۆجیای دەوڵەت بوو ئەو تاوانەی ئەنجام دا.

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە، یەك هێڵی سەرەکیی هەیە، کە کارەساتەکەی دەرسیم تیایدا ڕەنگی

داوەتەوە. دەتوانین بڵێین بە هەموویانەوە ڕۆمانێکیان لە 24 بەشدا نووسیوە. لێرەدا یەکێك لەو چیرۆکانە وەکو نموونەیەك دەکەینە کوردی...

## قەلەڕەشکە خوێناوییەکە
## یاڵچین توسون
## YalÇın Tosun

دۆینێ "ئەسما قالفا"مان بە خاك سپارد.

دوای دایك و باوکم ئەسما خۆشەویسترین کەس بوو لە لام، هەندێ جار بە من وا دەهات لەوانم زۆرتر خۆش دەویست، بەڵام نەمدەهێشت ئەم بیرۆکەیەم بەسەردا زاڵ بێت، بە کارێکی شیاوم نەدەزانی. وا ئێستا ئەسما قالفایەك لەم دونیایەدا نییە. دونیایە، هەموو بەرێ دەخات و باکی نییە، باوك و دایکیشم بڕۆن هەروایە...

من ئێستا دەزانم مرۆ کە لە خۆشەویستێکی دادەبڕێ، چەند ئەستەمە. ئەمە یەکەم جارمە کارێکی وام بەسەر دێ و خۆشەویستێك لە دەست دەدەم، تا ئێستا هیچ خۆشەویستێکم لە دەست نەداوە، خەمی گەورەم نەبینیوە. داواکارییەکانم هەمیشە بەدی دەهێنران و بێدڵییان نەدەکردم. وا دوای ئەسما، نازی مناڵییشم نەما...



لەم دوادواییەشدا لە هەموو کاتێ زیاتر پابەندی بووبووم. ئەسما بە گاڵتەوە دەیگوت ڕەنگە دوای یەك دوو ساڵێکی دیکە ئەفسەرە گەورەکانی هاوڕێی باوکت بێن خوازبێنیی تۆ لە من بکەن... هەمیشە جەفەنگ و قسەی خۆش و ختۆکەی دەدام، بەزم و هەرایەکمان دەنایەوە مەپرسە... دایکم، دەهات و بۆ ژوورەکەی خۆمی دەنارد... دایك و باوکم، هەموو شتێکیان بە جددی وەردەگرت. ئەو نازەی







ئەسما پیێ دەبەخشیم، لەوانم نەدەدی. سەمیمی سوپاسالاری باوکم و ناهیدەی هاوسەری، نە بەسنگەوەنووسان، نە ماچکردنی گەرمم لێنەدین، ئەوانەم لە ئەسما دەبینی. ئەسما بە دایکمی دەگوت "خۆراکی سارد"، بە باوکیشم "کۆلۆنێل بونژور"، چونکی باوکم لەگەڵ ئەفسەرە گەورەکانی هاوڕێیدا بە فرەنسی دەدوا و بە مسیۆ بانگی یەکترییان دەکرد. ئەسما کە ئەوەی دەژنەوت، زۆر پێدەکەنی. کە دەمپرسی بۆ بەو زمانە دەدوێن، دەیگوت ئەوە زمانێکی بیانییە، بەکاری نەهێنین لە بیری دەکەین...

وای دەگوت و چاوێکی لە هاوڕێکانی دەقرپاند، بەڵام من ئەو چاولێکردن و بزەهاتنەیم لە دڵەوە پیێ ناخۆش بوو... هەر کاتێ هەستم بە دڵتەنگی، بە بێحاڵییەك بکردایە، پەنام بۆ باوەشی گەرمی ئەسما دەبرد. کە منداڵ بووم، زۆرتر ئەو حاڵەتەم هەبوو. ئێستا گەورە بوومە و کەمتر ئەوە ڕوو دەدا...

شەوان لە ژوورەکەم ئۆقرەم نەدەگرت، خۆم لە باوەشی ئەودا دەبینییەوە. ئەویش هەر وەك لەگەڵ منیدا نەبێت، لەبەر خۆیەوە زۆر شتی سەیری دەگێڕایەوە. سەرم دەخستە سەر مەمکەکانی، بۆنێکی خۆش خاوی دەکردمەوە، بەڵام بەدەم گێڕانەوەی وڕێنەئاسای، خەو دەیبردمەوە. من چیرۆکەکانی ئەوم لە خەونەکانما دەدیت... هەموو جارێکیش هەمان چیرۆکی دووبارە دەکردەوە. منیش وەکو ئەو زۆربەی شەوانە هەر ئەو خەونەم دەدی، خەونەکە ئەوسا و ئێستاش دەمترسێنێ، دەشڵەژێم، بەتایبەتی ئەو شەوانە ئەو خەونەم دەبینی، کە لە باوەشیدا خەو دەیبردمەوە... بەیانییەکەی چۆنم دیبوو، ئاوام دەگێڕایەوە بۆ ئەسما. ئەویش متەقی لە خۆی دەبڕی، سەری خوار دەگرت. لە کاتی گێڕانەوەکەمدا قەت تەماشای منی نەدەکرد، کپ، بێدەنگ، مات گوێی لە من دەگرت:

"ئەسما، هەمدیس هەمان ئەو خەونەم بینی".

ـ ئەو خەونەی کە لە منداڵیمدا دەمبینی، خەونی پۆلە قەلەڕەشکەکان... لەسەر چیایەکی مۆر، لەوێدا ئەشکەوتێك هەبوو دەیەوێ من بۆ ئەشکەوتەکە بڕۆم. ژنێکی دەست و قژ خەناوی منداڵێکی ساوای بە کۆڵما داوە. لەتەنانێکم بە دەستەوەیە... منداڵە ساواکەی کۆڵم هەر یەك دوو ساڵێ لە من مناڵترە... کپوکڕ دەنگم لێوە نایەت. ژنەکە دەست بە قژما دێنێ... دەچەمێتەوە،



لە پێشدا من و دواجار هەست دەکەم منداڵەکەی کۆڵم بۆن دەکات... لە ئەشکەوتەکە کابرایەکی کاسکێتبەسەر دانیشتووە، مژ لە جگەرە دەدا و چاوی لە ئێمە بڕیوە. لێوی دەجوڵێ. ژنەکە دەڵێ ئێوە بڕۆن من دواجار دێم... منداڵەکەی کۆڵم نوزەنوزێك دەکات، دواجار بێدەنگ دەبێت. ژنەکە سەرەڕای دڵنیابوونی، لەیەکدابرانمانی پێ ناخۆش دیارە. بەڵام نازانم بۆ دەبێ من بڕۆم... هیواش هیواش بە دامێنی چیاکەدا سەردەکەوم، سەردەکەوم و هەست بە ناڕەحەتی و زەحمەتی ناکەم، لە چیا مۆرەکەوە کزەیەکی خۆش دێت و یاری بە قژەکەم دەکات، تا منداڵەکەی کۆڵیشم خەو دەیباتەوە... بەڵام لە دەمی ڕەشی ئەشکەوتەکە نزیك دەبمەوە، ترسیك دەچێتە دڵمەوە. لە پێش ئەشکەوتەکەدا پۆلێ قەلەڕەشکە بە ئاسمانەوە دێن و دەچن، دەترسم... بۆ دەبێ بچمە ناو ئەم ئەشکەوتەوە نازانم... هێشتا بۆ دەمی ئەشکەوتەکە کەمێکی مابوو، لە ناو قامیشەڵانێکدا دانیشتم و چاوم لە ئەشکەوتەکە بڕی... دەبینم بە پەلەپرۆزێ و شڵەژانەوە کەسانێك دەچنە ناو ئەشکەوتەکەوە، ئەو خەڵکانەش ترسەکەمیان نەڕەواندەوە. لەپڕ گوڕەگوڕێك لە ئاسمانەوە پەیدا بوو، ناڵەیەك ئەو ناوەی هەژاند، خۆم لەسەر دەم دەخەم. بیر لە منداڵەکە دەکەمەوە، دەڵێم ئێستا بەخەبەر دێ، بەڵام دەنگی نەبوو. بە ئەسپایی و ترسەوە، چاوم دەکەمەوە، لە دەمی ئەشکەوتەکەوە نێڵەنێڵ ئاگر و دووکەڵێکی خەست دەبینم. دەست بۆ پشتم دەبەم، دەنگی لێوە نایەت... لەم کاتەدا، قەلەڕەشکەیەك بە باڵەخشێ وا هاتووەتە نزیکمان... قەلەڕەشکەکە نافڕێ... بە باڵەخشێ لێمان نزیکتر دەبێتەوە، هاتووەتە لای لووتم... باڵەکانی خوێناوین. دەوروبەرەکە بە تەواوی خەریکە تاریك دەبێت. سەرهەڵدەبڕم، ئاسمان چون گەواڵەهەوری ڕەش قەلەڕەشکەیە... بە ئاسمانەوە دێن و دەچن، قیڕەیان ئەو ناوانەی گرتووەتەوە. قەلەڕەشکەکەی بەر لووتم، چاوی لە چاوم دەبڕێت، باڵە زامدارەکەی بۆ سەر زەوییەکە شۆڕ بووەتەوە. چاوم دەنوقێنم، لە خەونەکەمدا ئومێدی ئەوە دەخوازم ئەمە خەون بێت... زات لەبەر خۆم دەنێم و ئەم جارەش چاو دەکەمەوە... پیاوێك بەسەر سەرمەوە ڕاوەستاوە، لە پێشدا بە جلە پۆشتەکەیەوە وا دەزانم کەسێکی نەناسە... دواجار چاو هەڵدەبڕم ڕوومەتی دەبینم، بۆم ئاشکرا دەبێت کێیە... پیاوە ڕاوەستاوەکە جلی سەربازیی لە بەردایە... تومەز باوکمە!

بە ئەسپایی لە باوەشم دەگرێت. من هیچ ناڵێم... مینەی منداڵەکە دەکەم، لەسەر کۆڵم نەماوە، چیی لێهات، لە خۆم دەپرسم. باوکم شتێك دەڵێ، تێناگەم، ئەم جارەش دەپرسم، کوا منداڵەکە... وا دەڵێم و دەست بۆ کۆڵم دەبەم. باوکم هیچ





ناکات. دەگریم. باوەش بە باوکمدا دەکەم، قەتم وا دەست لە ملی نەکردووە... لە خەو دادەپەڕم... دیسانەوە هەر ئەو خەونەیە... بۆی دەگێڕمەوە... ئەسما قالفا، بە لەچکی سەرپۆشەکەی فرمێسکەکانی دەسڕێت. سەرم دەخاتە سەر ڕانی، لە پێشدا هیچ ناڵێت، بە ئەسپایی دەست بە قژما دێنێت... لەپڕ دەڵێت: "دوایی... دواجار لە خەونەکەتدا هیچت نەدی؟"... دەڵێم، هیچی دیکەم نەبینی... و هیچی ترم لە بیر نەماوە... شەو، بەر لە خەوتن، ئەسما قالفا دەچێتە لای پەنجەرەکەوە و بیری دەڕوا... ئەوە ماوەیەکە ئەو خەونە نابینم. ئێستا ئەسما مردووە، ڕەنگە جارێکی تر ئەو خەونە نەبینم، قەت ئەم خەونەم بۆ دایك و باوکم نەدەگێڕایەوە، حەزیشم نەدەکرد بۆیانی بگێڕمەوە...

خەریکە دەنووم، قەلەڕەشکەیەك، لەودیوەوە لە کەنار پەنجەرەکە نیشتووەتەوە، پەڕە قەترانییەکەی بەو شەوەش هەر دیارە و دەبریسکێتەوە، لەبەر خۆمەوە دەڵێم، هەر وەك لە خەونەکەمدا تەماشا دەکات، ڕەنگە لەوەتەی دونیا دونیایە، تەماشای قەلەڕەشکە هەروا بێت... ئەوەتا تەماشای من دەکات... وەك شتێکی بوێت، یان تووڕە بووبێت...

هیچ نەدەجوڵایەوە، تەنها تەماشای منی دەکرد... لە قەلەڕەشکە دەترسم... لە قەلەڕەشکەی خەونەکەم نەدەترسام، کەچی لەمەیان دەترسم... پڕ بە دڵ حەز دەکەم هەڵفرێت و بەر پەنجەرەکەم لێ بەربدا، ئاخرییەکەی، بانگی باوکمم کرد. کەمێکی پێچوو، دواتر هات... بۆ بانگم دەکەی؟



دەست بۆ پەنجەرەکە درێژ دەکەم "قەلەڕەشکە". باوکم بە سەرسامییەوە، "قەلەڕەشکە!! لێرەدا قەلەڕەشکە چی دەکات... نییە". دەڵێم "هەیە..." بە پەنجە ئاماژە بۆ پەنجەرەکە دەکەم. دواجار قەلەڕەشکە متبووەکەی کەنار پەنجەرەکە دەبینێ ـ بینیی، یان لەبەر من، وای نیشان دا کە دەیبینێ؟ ـ نازانم... بە پەنجەی شەقەی لە شووشەی پەنجەرەکە هەڵساند وەك هەڵیفرێنێ... لەسەر نوێنەکەم دادەنیشێ، وەك چۆن لە خەونەکەمدا باوەشم پێدا کرد، دەمەوێت باوەشی پێدا بکەم، زات ناکەم... بە ئاستەم پەنجەم لە قۆڵی دەخشێنم، ئەو بەتانییەکەم بەسەردا دەدا و لە ژوورەکە دەردەچێ... لەو بێدەنگییەدا، لە پەنجەرەکەوە ئاسمانم لێوە دیارە، کپ و بۆشاییەکی سامناك، وا دەنووم، نازانم ئەو دڵنیاییەشم لە کوێوە بۆ هات، کە ئیتر خەونی وا نابینم!!

# چەقۆکێشەکەی کۆڵانی سێیەم

## فەرهاد موستەفا

دەکرێت ئاوا دەست پێبکەم...

سەروەختێك، پەیکەرێك.. ئا لەو چوارڕیانەدا هەبووە. جاران سێ ڕیان بووە، چوار نەبووە. پەیکەرەکە وەك فولکەیەکی لێهاتووە، جادەیەکی چەوڕێژ لە ڕۆژهەڵاتەوە تێکەڵ بەو دوو جادەیە بووە، کە ئاڕاستەیەکیان بەرەو باکوور و ئەوەی تریان ڕووەو باشوور داکشاوە.

بەر لەوەی لە ساردترین شەوی شاردا پەیکەرەکە بڕوخێنرێت و لەو بەیانییە زوقماوییەدا کارگوزارەکانی شارەوانی زۆر بە زەحمەت و فەلاکەتەوە پارچەکانی بگوێزنەوە، چەند ڕیزێك سەرباز بە دەموچاوی هەڵپێچراوەوە چاودێریی گواستنەوە و نیگاکردنی خەڵکەکەیان کردووە. (3) کەس لە بەردەمی پەیکەرەکەدا گوللەباران کراون. (3) کەس لە لێوەشاوەترین چەقۆوەشێنەکان، هۆکارەکەشی ئەوە بووە لە شەوێکدا خراپترین پیاوی میریان بە پارچەپارچەکراوی بە پەیکەرەکەدا هەڵواسیوە. بەرەبەیانێکی دیکە گوریسێکیان کردووەتە ملی سەرۆك لە وێنەکەدا و بە خوار کەمەری





پەیکەرەکەدا شۆڕیان کردووەتەوە.
لەوە بەولاش پێکهاتەی پیاوە پەیکەرییەکە
وا دارێژراوە.. کە بە دەستی ڕاستییەوە
چەقۆیەك هەبووە و ڕووەو ئاسۆ
ڕوانیویەتی. دەنگۆیەك هەیە لە سەروەختی
دانانی پەیکەرەکەوە لێشاوی چەقۆوەشاندنیش
دەرکەوتووە و پیاوانی میریش، کەم و زۆر، خۆیان لە
شەڕەچەقۆی کۆڵان بە کۆڵانەکان نەبان کردووە. ئێستاشی لەگەڵ بێت،
پاش ئەو هەموو ساڵە، ناوەکەی بۆتە پاشگر و نازناوێکی پلاراوی و لە بەرۆکی گەڕەك و دانیشتوانەکەی نابێتەوە..
چون ئەوەی بۆ ئاژاوە و چەقۆکێشی خوڵقابێتین.
ئاخۆ پەیکەرەکەی بینیبێت؟
گەرچی بە تەمەن چەند ساڵێك لە من گەورەترە، لێ.. ماوەیەکی درێژ نییە هاتوونەتە کۆڵانەکەی ئەودیومانەوە،
حەوتەمین خانوون. ڕێك کەوتوونەتە  پشت ماڵی ئێمەوە، تا ئەوەی ئەتوانم لە سەربانەوە بچمە حەوشەکەیانەوە.
گەلێك جار بینیبووم. سلاوێکی سارد بە یەکتری دەبەستینەوە. هەموو جارێکیش کتێبێك یان ڕۆژنامەیەکی لوولکراوی
بە دەستەوە بوو. کەمەسۆراخێکی سەرپێی نەیگەیاندمە شتێکی تەسکینبەخش. وەك لە ڕووپەڕی ڕۆژنامە و گۆڤارێك
وێنەکەیم نەدی، لە ناو لێشاوی ئەو هەموو کەناڵ و چاوپێکەوتنانەش ڕێکەوتیم نەکرد.
کە بینیم...
جلەکانی منی پۆشیبوو. تەسکیی کراسەکە و کردنەوەی دوو قۆپچەی سەرەوەی، سەرنجێکی ناجۆری دەبەخشی.
سەیرتر، دەفتەرەکەم بە دەستییەوە بوو، زۆر بێموبالاتانە پەڕەکانی هەڵدەدایەوە و لێرەولەوێ  پاش لێڕوانینێکی
کورت دەفتەرەکەمی دادەخستەوە. بیرم دەکردەوە ئەو پەیوەندییەمان چۆن دروست کردووە. ئەوەم لە بیر بوو بۆ
خۆم دەفتەرەکەم گەیاندبووە لای زۆر کەس، چەندان نووسەر و هونەرمەند شوێنپەنجەی خۆیانیان لەسەر لاپەڕەکان
بەجێ هێشتبوو. لەو ئارامی و هێمنییەی خۆم سەرسام بووم.
دایکم وتی: سەرشانت تەداوی ناکەیت؟!
ویستم بڵێم شانم هیچی نییە. دەستم بەر پلاستەر و لەفاف کەوت، بە ڕاستییش برینێك بە سەرشانمەوە بۆ

خوارەوە داچووە. پێدەچوو دایکم پێشتر تەداویی بۆ کردبێتم! دیتۆڵ و لەفاف و مەقەست و پلاستەرەکە لە تەنیشت قەرەوێڵەکەوە بوو. هەوڵم دا لێی بپرسم.. ئەم قەرەوێڵەیە چۆن گەیشتووەتە ئێرە! بیرم دەکردەوە.. یان دەبوو بیر بکەمەوە.. ئەمانە چۆن ڕوویان داوە. تەنانەت دایکم نەپرسێت ئەو کەسە کێیە! ڕووی کردە دایکم:

هێندەمان پێناچێت دەگەڕێینەوە!

دایکم وتی:

ئەم جارەش زۆرتان پێنەچێت.

دایکم بەبێ ئەوەی داوای یارمەتی و هاریکاریم لێبکات، قەرەوێڵەکەی ڕاکێشایە بەردەمی دەرگای ژووری کتێبخانەکەم.

ڕووی کردە من: با بڕۆین!

پێڵاوەکانی لە پێکردم و خۆی دەرگای حەوشەی کردەوە، بەبێ پرس دوای کەوتم. کە هاتینە دەرەوە، دوو منداڵ کە نەمدەناسین، یارییان دەکرد.. یارییەکەشیان ئەوە بوو بە نۆرە تفیان لە یەکدی دەکرد. چەند هەنگاوێکمان نا، گەیشتینە سەرەتای سێڕیانەکە. پەیکەرەکە لەوێ بوو. مانگ ڕژابووە سەر ڕوخسارە تووڕەکەی، بە نیگایەکی عەجیبەوە لێی دەڕوانین. نا.. چاودێرییەکی وردی دەکرد. دەبوو سەرت نەوی کەی.. نزمتر وەك لە ئاستیا بچەمێیتەوە.. هێندەی ئەوەی لە دەست و مسکی کێردەکەی پارێزراو بیت. یەقینم وابوو.. ها ئێستا دێتە خوارێ. پێی وتم: دەبەنگانە ڕەفتار مەکە.

نەمپرسی چی! دەمخواست دەیان قاچم لێبڕوایە. ئاوڕم نەدایەوە. کە گەیشتینە کۆڵانەکە، دڵنیابووم مانگ لەسەر ڕوخساری بە جێما.

بە کۆڵانەکەی جاران نەدەچوو، خانووەکان هێندە بچووك و بێڕووناکی بوون، لە هێڵکاریی ئەو گەڕیدانە دەچوون، کە چەند سەد ساڵێك لەوەبەر کێشابوویان. ئەو کۆڵانەش دەڕژایە سێڕیانێکی سێگۆشەییەوە. لەوێدا پیاوێك بەو بەفربارینە گەنمی بۆ ئەو چۆلەکانە ڕشتبوو، کە چاوەکانیان هێندەی چاوی کوندەپەپوویەك گەورە بوون. بە کابراکەم وت:

سڵت لێناکەنەوە.

برسێتی شێریش دەستەمۆ دەکات.

ساتەوەختێکی درەنگتر گەیشتە لامان، هەمان پرسیار و وەڵام ڕووی دایەوە.





وتی:

ـ ئەم قەیتانە لەعنەتییانە زوو زوو دەکرێنەوە.

وتم.. بێمانایانە خۆت درەنگ دەخەیت.

پێکەنی.. یان هەوڵی دا پێبکەنێت. کە دەیوت سەری پەنجەکانم تەزیون.. قاچی خۆمم بۆ نەبینرا و هەستم بەو سەرمایە نەدەکرد، کە ئەو کردبوویە بیانووی خاووخلیچکییەکەی. خێراتر هەنگاوم نا. بۆ تاوێك دیار نەما و من گەیشتبوومە لای ئەو ڕووناکییەی لە دوکانێکی بچکۆلەوە دەرژایە کۆڵانەکە. پیاوێکی ڕەقەڵەی لێبوو.. کتومت بە (ساموێل بێکێت) ئەچوو. چاویلکەکەی چاوی هێندەی دەستجولانەکەی دەجولا، ڕووناکیی مۆمەکە زیاتر. دەمویست بزانم.. بەم نیوەشەوە چی هەڵدەکۆڵێت. ناو دوکانەکەشی جگە لە پێستە ڕێوییەك و کەوڵی دەڵەکێك و داڵاشێکی وشکراو، شتێکی سەرنجبەخشی لێنەبوو. وەك ئەوەی پرسیارم لێکردبێت، وتی:

ـ ئاوێنەکانیش درۆزنن.

گەیشتە لامان، هێندە لە هەڵکۆڵینەکەی چووە پێشەوە، کە سەیربوو چەقۆکە نەچوو بە چاویدا. کە کەوتینە ڕێ، وتی: لەوەتەی لە بیابان گەڕاوەتەوە، خەریکی هەڵکۆڵینی ڕوخساری خۆیەتی و بۆی تەواو ناکرێت.

پێشتر نە ئەو پیاوەم بینیبوو، نە ئەو دوکانەش لەوێدا هەبوو.. دەفتەرەکەشم خاڵی نەبوو لە چیرۆکەکانی بیابان. نووسەرێك بۆی نوسیبووم...

(پیاوێکی ناو بیابان، گفتی پێدابوون. سەربازەکان لە ناو خۆیاندا گرەویان کردبوو ئەوە مەحاڵە. چەقۆکەیان بۆ هێنا.. تەواوی سێرەی تفەنگ و چاوەکان بڕوایان بەوە نەدەهێنا ئەوەتا مرۆڤێك بە دەستی خۆی چاوی خۆی هەڵدەکۆڵێت).

شاعیرێکیش لە لاپەڕەی ئەودیوی، بۆی نوسیبووم... (ئەگەرچی خاڵی هاوبەشی هەر هەموویان مردن بوو.. بەڵام مردنەکان و پێشوازیکردن لە مەرگ جیاواز بوون.. هەمیشە لە گێڕانەوەدا شکست دەهێنم.. نەوبووکەکە، زەفەر بە قەمەی تفەنگی ئەو سەربازە دەبات، ئەوەتا خۆی بۆ ڕووتوقووت کردووەتەوە. سەربازەکە دەشڵەژێ.. باوەڕ بەوە ناهێنێت، ئافرەتێك توانای هەبێت قەمەیەك بە ژێر مەمکی خۆیدا ڕابدات...).

وتم: پلوپەنجەی لە هونەرمەندێك دەچێت ڕشتەیەکی هونەریی بەرزی خوێندبێت.

وتی: هونەری چەقۆوەشاندن هێندەیە.. چۆن چەقۆکە دەگریت.. کوێی دەکەیت بە نیشانە، بە چ مەبەستێك دای دەهێڵیت.
من بە کردنەوەی قۆپچەکانمەوە خەریك بووم. قۆپچەکانم بۆ نەدەدۆزرایەوە و دەمزانی عارەقێکی زۆرم کردووەتەوە. لە سەرەتای کۆڵانی سێیەم گەیشتینە لایان. **6** یان **7** کەس دەبوون. تاکەکەسێکیان جگەرەی دەکێشا و بە درێژای ئەو ڕێگەیە جگەرەم نەکێشابوو. لە ئاستی جگەرەکێشەکەدا پێیەکی بە شێوەی سەربازی کێشا بە زەوییەکەدا و منیش لەگەڵ سڵاوکردنەکەم دەستم بەکار برد، گوێم لێنەبوو وەڵامی سڵاوەکەم بدەنەوە. پێی وت:
گەورەم.. ئەمەیە!
هیچی لێنەپرسیم. کەسێکیان هاتە پشتمەوە و شتێکی نوکتیژ، کە وابزانم چەقۆ بوو، چەقاندی بە سەرشانمدا. یەکێکیان وتی:
گەورەم.. چ خێرێك دەداتەوە.. بۆ لە ملی نەدات؟
گەرچی ئازارم نەبوو، هەستم بە تەڕاییەکەی سەرشانم دەکرد، لێم مەعلوم بوو خوێن لە شوێن دەمی چەقۆکەوە بە لاشان و دەفەی شانمدا دێتە خوارێ. هیچ پەرچەکردارێکم نەبوو. دەمویست بیر لەو ئافرەتە بکەمەوە ئەو ئازایەتییەی لە کوێوە دەست کەوتووە کە بتوانێت قەمەکە لە تفەنگەکە بکاتەوە و بە شێواندنی جەستەی خۆی ئەو سەربازە زارەترەك بکات تا نەهێڵێت هەوەسی خۆی پێ دابمرکێنێتەوە. تەماشای ئەوم دەکرد.. دەفتەرەکەی بە دەستەوە بوو. ئێستا بیرم دەکەوێتەوە بۆ لێم نەپرسی دەفتەرەکەم چۆن گەیشتووەتە لای تۆ!
پیاوەکە جگەرەکەی فڕێ دا و بڵمەبڵمێکی کرد، بایی ئەوە نەبوو لێی تێبگەم. ئاماژەیەکی بۆ کرد.
چەقۆیەکی لە ناو دەفتەرەکەمدا دەرهێنا و بە دەستی چەپی بۆی درێژ کردم کە لێی وەربگرم. چەقۆکەم لە پێشەوە لێ وەرگرت، کە دەفتەرەکەشی دامەوە. یەکەمین کەسیان سەرگەورەکەیان تەوقەی لەگەڵ کردم و وتی:
- پیرۆزباییت لێدەکەم!
ئەوانیش بە یەك ڕیتم و تۆن.. تەوقە و پیرۆزباییان لێکردم. سەرگەورەکە بۆ خۆی چەقۆکەی لە سەرشانم دەرکێشا، وتی:





- هیوادارم لە ئەرکەکانتدا کارامە و چالاك بیت!

بلوسەکەیان بۆ داکەندم و کەوتنە پاکردنەوەی ئەو خوێنەی لە شانم هاتبوو.

لەگەڵ پێچانەوەی لەفافەکاندا پێیان ڕاگەیاندم.. بچمە ناو خەیاڵدانی ئەو کەسانەی کە توانای بنیاتنان و گێڕانەوەی خەیاڵیان هەیە..

چەقۆکەم لە سەرشانی بچەقێنم. بە نەرمییەوە.. تا ئەوەی هێما هەڵکۆڵراوەکەی لادەمی چەقۆکە لە شانیا ون دەبێت. ئێستا.. دەڕوانمە هێما هەڵکۆڵراوەکە.. ئەوەتا ئەفسوناوییانە دەبریسکێتەوە.

# حیکایەتی مێش

**توانا ئەمین**

بۆ یەهودای ئەسخریوتی



١

"حیکایەتی مێشت بۆ بگێڕمەوە؟

- بەڵێ..

مەڵێ: ((بەڵێ))!

- ئەی بڵێم چی؟!

مەڵێ: ((ئەی بڵێم چێ))!!"

٢

یەهودا.. سەیری ناوچاوم بکە.. ئەو ئێوارەیەت بیر دێ کە لەخاچیان دام..؟!

سەر دامەخە.. وەڵام بدەرەوە..!

باوکم سەر ڕادەوەشێنی و بە نیگەرانییەوە دەڵێ: "نـــا، بەس ئەو بایە لەو کونەوە بێ...."

من بە پرتاو خۆم دەکەم بە قسەکەی باوکمدا و دەڵێم: ژیان ناخۆشیش نییە، ئەگەر تاقەتت هەبێ دانەویتەوە و دابەزی..

دابەزی..

دابەزی بۆ ئاستی جرج!

یەهودا.. لە زاری تۆوە بەو وەحدەهو لاشەریکە لە..یە دەڵێم؛ وەرە بە مەرجی وەرنەگرتنەوە، تەنیاییەکانمان بگۆڕینەوە..! خۆی دەزانێ؛ من پزیشکی مرۆڤم، بۆ ئەوە نا زامەکانیان تیمار بکەم، بۆ ئەوەی خوێ بکەمە برینیانەوە.. (کەواتە)ی ناوێ، من تـــەنـیــــــام و من هەم.

یەهودا.. تۆ دەزانی ئەوەی لە مندایە، دڵ نییە.. دووڕی یەتیمە و بە شەوارەیان دەخات.. ئەوەی لە مندا دەدرەوشێتەوە، ڕووناکییەکی تاریکە.. تۆ دەزانی ئادەم باوکی من نییە و من لە قوڕێکی ترم..؟ من خۆم کوڕی خۆمم..!

یەهودا.. تۆ وا دەزانی هەر جارێ لە خاچ دراوم..؟ نـــا.. من چەند جارێکی تر مردووم و زیندوو بوومەتەوە، قسەی حسابی هەر ئەوەیە؛ کە مردن زۆر لێرەش ناخۆشتر نییە..

یەهودا.. تۆ کۆنیت، بەڵام تۆ چیرۆکی یوسفت نەبیستووە.. تۆ نازانی ژیان لە کوردستان تونێلێکی قەپاتە، مەنهۆڵێکی داخراو، خەڵکی لە هەر شتێ زیاتر، چەقۆ لە یەکتردا سەرف دەکەن.. بۆیە بەبێ دوودڵی؛ ئەگەر خوێڕیترین براکانی دونیا؛ ئەوانەی یوسف بن، خوێڕیترین برادەرەکانی دونیا؛ ئەوانەی منن..

یەهودا.. بیرت نەچێ؛ لە داخی خەراپترین برادەرەکانی دونیا، بیرم بخەیتەوە؛

خۆم بخەمە ژێر قیتارێك لە خێرایی ٣٠٠٠ کم لە سەعاتێ... نا ٣٠٠٠ کم لە نیگەرانییەکدا.

سەیری خۆم دەکەم؛ ئەوەی لە مندا دێت و دەڕوات، خوێن نییە، قەترانە.. یەهودا.. کتێبە کۆن و زەردەکان مۆتالا دەکەم و وێڵی دوای خودایەکم ئینسان بپەرستێ و پێی بڵێم: شاهیدی دەدەم کە

تۆ هەیت و حەقیت..! حەیف کە ئێستا نییە و وەهمە.
یەهودا.. من کە دڵم تەنگ دەبێ؛ بە تەنیا لە گوێ چەمێکدا دادەنیشم و ئـاو دەژەنم.. بڕوانە؛ ئەستێرە وەك پسەری بێباوك، ڕژاونەتە ئاسمانمەوە..! تەماشاکە؛ سەگێکی ڕەش کچێکی سپیی بردووە بۆ پیاسە.. جا لە کوێی مەجدەلییەی من؛ لە هەزارپیشەی ئومێدتدا بۆم هەڵچنیت؛ چین چین.. قات قات.. ئەم کراسە دڕاوانەی نائومێدییم..؟! مریەم.. من نامەوێ تۆ لە قەفەزی پێنج پیتدا دیل بیت.. بۆیە هەر جارە پیتێك ئازاد، هەر جارە فۆنیمێکت بەرەڵا دەکەم.. یەهودا.. من لە چاوەڕوانیدا دەمرم.. بەیانییەك لە خەو هەڵدەستم و تەماشا دەکەم؛ مردن ئازیزێکی تری بردووین، دە وەرە من بە تەمای کێ بووم..؟! مـردن بۆ مـردن.. مـــــردن بۆ من..!

٣

یەهودا.. تۆ دەزانی ئێستا.. هەر ئائێستا دەڵێم.. هەزار ســەگ پێکەوە لە سەرمدا دەوەڕن...؟!!!
من نامەوێ دونیا بگۆڕێ.. ئەگەر بگۆڕێ، ڕێ دەرنابەم، دەبێ ببم بە پیاوێکی موحتەرەم، کە ناتوانم ببم.. ئەوەی لە مندا دەگوزەرێ، کانییەکی تازەیە، کە ئازارێکی سازگاری لێ هەڵدەقوڵێ.. یەهودا.. من حەز دەکەم زەوی هەشت جار لەتلەت ببێت.. هەپروون بە هەپروون.. بەڵام بە دەستی ئینسان نـــا...!
یەهودا.. گەردوون لە مندا ئێشێت.. حەز دەکەم دونیا بتۆرێنم.. بەڵام من بۆ نەچم شەوێکی درەنگ سەربخەمە سەرشانی ئەو مەجدەلییە و بە هێواشی لێوم بە گەردنیەوە بنووسێنم و ئەو بۆ نەیەت و بە چرپە بڵێ: "فلانی... دەزانی تۆ هەزار پیاویت لە پیاوێکدا..؟!"
یەهودا.. تۆ کوردی دەزانی، کوردی..؟!!
دەمن زۆر تەنیام.........!
یەهودا.. ئەم گۆرانییە ئاخری دەمانکوژێت.. ئێستا بیری نییە؛ کە کاسێتە قاوەییەکەی بۆ هێنام، وەك یاسەمینی ناو شامپۆکەی ئەو کات، قژی خستبووە سەر لا، گوڵێکی لە کەزێی دابوو، کە ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە لە زەینی مندا ئەوەندە کاڵ بووەتەوە، ڕەنگەکەی ناناسمەوە.. کەچی بەرامەی سەری پڕ کردووم!
یەهودا.. خۆشە: هەست بکەیت؛ ئەوەی سەر خاچەکە تۆیت..؟ ئەوەی زەوی



لەگەڵی بێوەفا بوو..؟ ئەوەی ئاسمانیش جێی هێشت..؟! ها..؟ وەڵامم بدەرەوە، خۆشە..؟!!

٤

ئاهـ من چەند قەرەباڵغ و چەند تـەنـیـــام خودایە.

یەهودا.. مەنفا خۆشە.. بەڵام ئەوەی لێرە بێ و بیری نیشتیمان بکات، دەمرێ.. دڵت لام نەبێ ئەوە من نیم..! بیرتە شەوێکی بەفراوی مریەم بە قژی تەڕەوە خۆی کرد بە ژوورەکەمدا و وتی: "دوای نەڵێی پێی نەوتم؛ ئالودەبوون بە ماجیدە ڕومی وەك موعتادبوون بە هێرۆیین وایە"..؟! یەهودا.. خۆ ئێستا نییە، تا پێی بڵێم: کچێ من غەریبم، بەڵام غەریبی سەخت نییە.. سەخت ئەوەیە تـــۆی لێ نیت..!

بەو خودایەی ئاگای لە دڵەکانە، یەهودا.. قسەکردن لەگەڵ مریەم؛ بێدەنگی و بێدەنگی لەگەڵ ئەو؛ قسەکردنە.. کە تۆیان کرد بە خائین، دەیانویست لە جێی تۆ؛ میتیاس لە عەرشی دڵیاندا دانێن و داشیان نا..

دەیبینیت؛ جامی پڕ لە دەستمدا خاڵییە..؟ هەموو زۆرێکم پێ کەمە.. دەیبینیت؛ خۆ هەر من نیم؛ هەموو ئەوانەی دەزانن باش قسە بکەن، نازانن باش بژین.. یەهودا.. بیرم بخەرەوە دوایی چیرۆکی براکانت بۆ تەواو بکەم.. ئەڵێی شتێکم ون کردووە، ئەڵی وێڵی دوای شتێکم.. بیر لەوە دەکەمەوە ڕێ بەرم بۆ هیندستان.. بەڵکم خوایا پیرم لەوێ بێ و تـــۆ بڵێ: ئـــامین!

یەهودا.. من لێرە بم یان لە ئورشەلیم.. لە دلهی بم یا لە پراگ.. من نوێنەری غەمی هەسارەیەکی ترم لەسەر زەوی..

من؛ باڵوێزی نائومێدییم..!

من ڕووناکی هەڵدەمژم و بیری خۆم دەکەم.. خۆم لە لای تـــۆ..!

یەهودا.. بیرت دێ بە سی سکەی زیو منت فرۆشت..؟ سی سکە.. سی سکە.. سی سکەی حیز.. بەڵام ئێستا ئیتر نامەوێ نە بۆ خیانەتی تۆ و نە بۆ دەستی مریەم و نە بۆ هیچ گەوادێکی تر خۆم بکوژم.. خۆکوشتن سزادانی خۆتە بە تاوانێك، کە ئەوانی تر کردوویانە..!

٥

با کریستۆسی سەرخاچەکەش من بم.. خۆ بە دەست خۆم نییە، هەر بیرت دەکەم..!

یەهودا.. وەك سۆفیا ڕێگەیەکی داخراوم.. بە دەگمەن خەڵك دێنە منەوە، بەڵام ناوەوە قەفەسە، با هیچ مەجدەلییەکی تر نەیەت و کە هات، خەیاڵی خاوی ڕۆیشتن لە سەری جەنجاڵی خۆیدا دەربکات.. چونکە ئەو خودای تەعالایە ئەم قەفەسەی وا خراپ دروست کردووە؛ کە هەر یەك جار دەرگاکەی باز دەبێ..!

چی بکەم؟ ئەم دەرگایە دەکەمەوە و ئاشناییت لەتەك دائەخەم.. سەرم لە خەڵکێ ئاوساوە کە پێدەکەنن.. من لە قوڕی تۆ نیم.. یەهودا.. من لە هەویرێکی ترم؛ لە مەعجوبەی ئازار..! ئەمڕۆ خراپترین ڕۆژی منە، لەوە خراپتر ئەوەیە سەرم دەخورێنم و چاوەڕێی ڕۆژێکی خراپترم.. من برین دەجنم و خوێن دەدڵۆپێنم و ئازار دەکەمە کاسەوە..

یەهودا.. شتێکت پێدەڵێم.. بەس بە کەس مەڵێ؛

سەرم پڕە لە چەقۆۆۆۆ..!!!

یەهودا.. مریەم حاڵی بکە بە خوفییە؛ کە بێغایەت پەرێشانم و جێی هێشتووم.. وەك چۆن خودا مرۆڤی جێ هێشتووە.. بەڵام قەینا یەهودا.. هەر ئێمە خودامان نییە.. خوداش ئێمەی هەیە.. حەیفی ئەوەم لێدێ؛ من لە زەوییەکدا دەژیم لەژێریدا کرم و لەسەریدا جرج و لە ئاسمانیدا قەلەڕەش هەیە.. ئەسخریوتی.. ئەوەی بە ئینسان دەڵێ جوان، یان کەرە یان شاعیر..!

حەزم دەکرد خانمی پیلاتۆس لە خاچم بدات.. بە خاچێك کە لە ملیدایە.. یەهودا .. خۆ بەوە نییە؛ لای چەپە، من خۆم دەزانم؛ هەر دڵم ڕاستە.. کاهینەکانی پێش منیش دەیانگوت: دەبوو خودا هەندێ حسابی تری بکردابا.. بەڵام ئێستا کە ئەو نایکات، من دەبێ بیکەم، حسابە ئیتر..!! حسابی شاردنەوەی ئەو لە باجوەرگرەکان لە پەستێوی خەزنە کۆنەکانی دڵما.. خۆ ئەو موحەممەد نییە بانگی بە ئاشکرا خۆش بێت، من حەز دەکەم کەس نەزانێ کە بیری دەکەمەوە..!

ئەسخریوتی.. قوڵپ ئەدا ئەم قەلەقییەم و بە هەموو هێزم؛ بە خێرایی ڕووناکیی خۆم دەکێشم بەم کاکێشانەدا.. تۆ نازانی لە حەسرەت هیجری مریەم؛ شەوان من چییم لێدێ..؟ ئەم شەو لە خەونمدا دووپشك دەباری..!! و





دایکم ئیبن سیرین موتالا دەکات و دەڵێ: "خودا بە خێری دەگێڕێ ئیشەڵڵا"..

یەهودا.. تۆ بە (ئارامی) دەئاخفێی، شتێك دەڵێم، ڕەنگە تێنەگەیت؛ بەس دەزانی (ئازار) بە (کوردی) خۆشترە..؟! ئێواران قۆڵ دەکەم بە قۆڵیدا، بە تەنوورەیەکی کاڵی کاوبۆیی کورتەوە، ئەو جادەیە دەخاتە ژێر نازی خۆیەوە، خەڵك تەماشامان دەکەن.. دەزانم هەمووان ئیرەیی بە من دەبەن، کە دەتوانم هەموو شەوێ بتبەمەوە ماڵەکەی خۆم؛ ئەی تەنیایی..!!

یەهودا.. نائومێدیی من لە مریەم، نائومێدیی نییە لە پێنج پیت.. نائومێدیی نییە لە هەموو ئەو پیتانەی ناوی ژنەکانی دونیا پێك دەهێنن، نائومێدیی من لە مریەم؛ نائومێدییە لە ئینسان!

کوڕی ناپاکی جەلیلییە.. دەبێ بزانی؛ من هیچم لە خەڵك زیاتر نییە، دڵتەنگییەکەم نەبێت.. دەزانم قۆڕە، بەڵام یارییەکی ئەوەندەش ناخۆش نییە ژیان، ئەگەر تاقەتی چاوەڕوانیت هەبێت..!

گێژ بووم بەدەست ئەم هەموو مێشەوە؛ هەموان مەراقیان ناوگەڵی ژنێکە و من مەراقی ناوگەڵی جیهانم.. سەرم پڕە لە قالۆنچە.. وا بە دوای یەکدا بە پێچپێچەکانی گوێمدا دێنە دەرێ و ئەم بالیفە سپییەیان ڕەش کردووە.. پێوەم دەدەن.. هەموویان بەیەکەوە و لە یەك کاتدا قەپاڵ دەگرن..!

وەك ئادەمیزادێ دەمەوێت لە خۆم دەرچم و بچەمە قەرەباڵغیی ئێوارانی گەراژێك، لە ناو عەشاماتێك ڕێبواری ژانتابەشاندا خۆم ون بکەم. بە دزیی دونیاوە سوار پاسێکی کۆنی درێژ ببم و لەگەڵ ئەو موسافیرانە بچم بۆ شوێنێك، شوێنێك کە نازانم کوێیە..!!

یەهودا.. جا دەکرێ هەر وەرزێك یەکێ جێت بهێڵێ و یەکێ خۆیت پیاهەڵواسێت..؟ ئـا، دەکرێ.. بەمە دەڵێن: ژیانی دڕاو..!

خودایا.. من لەم بەرهەمە جوانەت کە ناوی ئینسانە؛

نــــائــــومێــــــدم

نــــائــــومێــــــدم

نــــائــــومێــــــدم.. و ناوی خۆم دەگۆڕم بۆ شتێ، کە خەیاڵی دروستکردنی هێشتا لە

سەری خەلیقەتدا نییە..!

لە زانکۆم.. مامۆستا نیگای گلەیی دەچەقێنێتە چاوم.. دەزانێ ئەمڕۆ لێرە نیم.. دەزانێ ئەمڕۆ باش نیم.. دوێنێش باش نەبووم.. سبەینێشم لە ئەمڕۆ و دوێنێم ڕۆشنتر نییە.. هیچ ناڵێ.. هیچ ناڵێم.. بە دوو سێ تووڵەڕێی بەردەڵانی سەختا وەك ڕێمان ون کردبێ، خواروژوور دەکەین.. من ڕوو وەردەگێڕم.. لە تـــۆ نـــا.. لە خۆم ڕوو وەردەگێڕم..!

ئەی پیاوێك کە منت فرۆشت.. سەیر بکە؛ بەم عەسرە، سەرم پڕە لە گوێزان..!

تەواو... ئەی خۆکوشتن.. ئەی دۆستی شیرین، ئەی هاوڕێی نیانم.. ئەی ئەستێرەی سیوەیلی بەختی من.. من ئیتر چاو دەبڕمە ناو چاوی تۆ..! بیر لە سەگێکی قاوەیی گەورە دەکەمەوە لە سەری خۆمدا و هیچ قسەیەکم بۆ بەشەرییەت نییە، ئەو بەشەرییەتەی بە (ب)ی بێقیمەتی دەست پێدەکات..

یەهودا.. ئێستا دەڵێی چی دوای حیکایەتی مێش، حیکایەتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە..؟

**2014**/ ستۆکهۆڵم







# دەریا تۆرا

یەشار کەمال

وەرگێڕانی لە تورکییەوە

ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل

یەشار کەمال دەریا تۆرا ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل





# تا ئاگرێك بکرێتەوە

**جاك لەندەن**
**و. لە ئینگلیزییەوە: ژوان شوانی**

جاك لەندەن (١٨٧٦ – ١٩١٦) نووسەر و ڕۆژنامەوان و چالاکوانی ئەمەریکی. لە نووسینی فیکشندا پێشەنگ بووە و یەکەمین نووسەرە کە بە هۆی فیکشنەوە بووەتە خاوەنی ناوبانگێکی جیهانی و سەروەتوسامانێکی گەورە. کاتێك فلۆرای دایکی؛ بە جاك دووگیان دەبێ، مێردەکەی داوای لەباربردنی دەکا، بەڵام فلۆرا قاییل نابێ؛ دواتر فلۆرا دەبێتە هاوسەری جۆن لەندەن و لەگەڵ ئەودا جاك گەورە دەکا. کاتێك جاك خوێندکاری زانکۆ دەبێت، سۆراخی باوکی دەکات و نامەی بۆ دەنووسێت، باوکیشی لە نامەیەکدا پێی دەڵێت کە ئەو هەرگیز نەیتوانیوە منداڵی ببێت و نکۆڵی لە باوکێتیی خۆی دەکات. جاك بەم هەواڵە زۆر نیگەران دەبێت؛ واز لە زانکۆ دەهێنێت و دەچێت بۆ کارکردن لە کانی ئاڵتوونی کلۆندایك. لێرەوە جاك هەست بە ئێش و ئازارەکانی چینی کرێکاران دەکات و دەبێتە چالاکوانێکی داکۆکیکەر لە مافی کرێکاران. هەندێك لە چیرۆکە دیارەکانی لەندەن بریتین لە "کەڵبەی سپی"، "خۆشویستنی ژیان" و "مرواریيەکانی پارلای".

ڕۆژ ڕووەو سەرما وەردەگەڕا و خۆڵەمێشیی دادەگەڕا، دونیا ئێجگار سارد بوو کاتێك پیاوەکە لە ڕێگە سەرەکییەکەی ڕووباری یوکان لای دا و بە ڕۆخی ڕووبارەکە و بە باریکەڕێیەکی تاریك و کەم پێداڕۆیشتووی ڕووەو خۆرهەڵاتدا، کە دەچووەوە سەر دارستانێکی چڕی سنەوبەر، هەڵدەگژا. ڕۆخەکە بەرز بوو، کاتێ گەیشتە سەرەوە، تا هەناسەیەکی وەبەردا بێتەوە، پشوویەکی کورتی دا و تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد. سەعات نۆ بوو. گەرچی چ پەڵەهەورێکیش بە ئاسمانەوە نەبوو، کەچی نە خۆر دیار و نە بە نیازی ئەوەش بوو دیار بێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئاسمان ساماڵ بوو، بەڵام تەمێکی خەمین لەسەر هەموو شتێك نیشتبوو. شتێك وەك نائومێدیی ڕۆژەکەی تاریك کردبوو، ئەوەش بە هۆی دیارنەبوونی خۆرەوە بوو. ئەمە پیاوەکەی نیگەران نەدەکرد. ئاخر ئەو بە نەبوونی خۆر ڕاهاتبوو. چەندین ڕۆژ بوو خۆری نەدیبوو و دەشیزانی چەند ڕۆژێکی تریش ماوە تا ئەو تۆپە ڕۆشن و دڵخۆشکەرە لە ئاسۆی باشوورەوە دەربکەوێت و کتوپڕ ئاوابێت و لە چاوان بزر ببێت.
کابرا ئاوڕێکی خێرای لەو ڕێگایە دایەوە، کە پیایدا هاتبوو. یوکان میلێك پان و لەژێر ئەستووراییی مەترێك شەختەدا ڕاکشابوو. بەسەر شەختەکەشەوە هێندەی تر بەفر باریبوو. هەموو شت سپیی سادە بوو، پێچی بەفر و شەختە نەرم نەرم تێکەڵی یەکتری بووبوون. باکوور تا باشوور، جگە لە ڕەشایی بن دارسنەوبەرەکان، کە لە باشوورەوە پێچیان دەخوارد تا لە باکووردا وەك لێواری دوورگەیەك دیار نەدەمان، تا چاو بڕ کا، هەر سپێتییەکی بێکۆتایی بوو. ئەم خەتە ڕەشە ڕێگە سەرەکییەکە بوو، کە پێنجسەد میل بەرەو باشوور درێژ دەبووەوە تا دەگەیشتە ناوچەی چیلکووت و دێیە و ئاوی سوێر؛ پاشان حەفتا میل بەرەو داوسن لە باکوور و هەزار میل بەرەو نولاتۆ و سان میکایل لەسەر زەریای بێرینگ، هەزار میلی تر و نیوەهەزار میلی تریش هەر ئەم ڕێیە بوو.
بەڵام هەموو ئەمانە - ڕێگا پەنهان و دوورودرێژەکە و نەبوونی خۆر بە ئاسمانەوە و سەرما بڕندەکە و سەیر و سەمەرەیی شتەکان - هەر هیچ پیاوەیان نیگەران نەکردبوو. ئەوەش نەك لەبەر ئەوەی پێیان ڕاهاتبێ، بەڵکو ئەو چیچاکۆ[1] بوو، تازەکی هاتبووە ئێرە و ئەمە یەکەمین زستانی بوو.

کێشەی ئەم پیاوە ئەوە بوو، کە خەیاڵ و وێناکردنی نەبوو. ئەو خێرا و وریا بوو لە شتگەلی ژیانی ڕۆژانەدا، بەڵام تەنیا لە خودی شتەکان، نەك لە بایەخیاندا. پەنجا پلەی ژێر سفر واتا هەشتا پلەی ڕەقبوونەوە؛ لای ئەو حەقیقەتێکی وا مانای سەرمایەکی ناخۆشی دەدا و هیچی تر. ئەوە وای لێنەدەکرد بیر لە لاوازیی خۆی لە پلەی گەرمای ژێر سفر و لاوازیی بەنیئادەم بەگشتی، کە تەنیا لە سنوورێکی دیاریکراوی پلەی گەرما و سەرمادا دەتوانن بژی؛ بکاتەوە. هەر بۆیە بیری لە مەسەلەی مردن و پێگەی بەشەری لە گەردووندا نەدەکردەوە. پەنجا پلەی ژێر سفر لای ئەو مانای سەهۆڵبەندانێکی بڕندەی گوێزانئاسا بوو؛ کە دەبوو بە بەکارهێنانی دەستکێش و کڵاوی گوێچکەدار و پووتی چەرم و گەرم و گۆرەویی ئەستوور بەری پێبگیرێ. پەنجا پلەی ژێر سفر بۆ ئەو لە پەنجا پلەی ژێر سفر زیاتر، هیچ مانایەکی تری نەبوو. ئەگەر واتایەکی لەوە زیاتری هەبا، ئەوە خەیاڵێك بوو کە هەرگیز بە مێشکیدا نەدەهات.

بەدەم ڕۆیشتنەوە جارجار بە لەزەتێکی بێئاگایانەوە تفی ڕۆ دەکرد. دەنگێك لە تفەکەیەوە دەهات و بەو دەنگە ڕادەچڵەکی. دیسان تفی دەکردەوە. ئەم جارەش کە لە هەوادا تفی کرد؛ پێش ئەوەی تفەکە بگاتە زەوی، دەنگی تەقەیەك لە تفەکەیەوە هات. ئەو دەیزانی کە لە پەنجا پلەی ژێر سفردا تف لەسەر بەفرەکە دەیبەستێ و ئەو دەنگەی لێوە دێت، بەڵام ئەم تفە لە هەوادا بەستی. گومانی تێدا نەبوو کە پلەی گەرما لە پەنجای ژێر سفر نزمتر بوو - چەندێك نزمتر، نەیدەزانی. بەڵام پلەی گەرما لای ئەو چ بایەخێکی نەبوو.

کابرا بەرەو دوورێیانەکەی شیوی هێندەرسۆن، کە کوڕەکانی لێبوون، ملی ڕێی گرتبووە بەر. ئەوان لە گوندی "ئندیان کریك"ـەوە ڕێگەکەیان قەدبڕ کردبوو، بەڵام ئەم دەوراندەوری ناوچەکەی لەپێوە دابوو تا سەیرێکی دەوروبەری ڕووباری یوکان بکات؛ بەو مەرامەی بەڵکو دارستانێکی گونجاو بدۆزێتەوە و بەهاران داروباری لێبهێنێت. ڕاستە ئەو نزیکی سەعات شەشی ئێوارە دەگەیشتە لای کوڕەکان، بەڵام مەزەندەی دەکرد کاتێ ئەم دەگات، ئەوان لەوێ دەبن، ئاگرێکیان کردووەتەوە و شێوێکی گەرمیشیان لێناوە. سەبارەت بە نانی نیوەڕۆ، دەستی نایە سەر تۆپەڵێکی هەڵتۆقیو لەژێر پاڵتۆکەیدا. تۆپەڵێك چۆرەك لە دەستەسڕێکەوە پێچراو و لەژێر پاڵتۆ و کراسەکەیدا بە پێستییەوە نووسابوو. ئاخر تەنها بەم شێوەیە چۆرەکەکە نەیدەبەست. کاتێ بیری لە چۆرەکەکان کردەوە کە هەریەکەیان لە ڕۆنی بەراز هەڵکێشراون و هەریەکەیان پلێ گۆشتی بەرازی سوورەوەکراویشیان تێئاخنراوە، زەردەی خۆشحاڵانەی هاتێ.



نوقمی ناو دار سنەوبەرە گەورەکان بوو. ڕێگاکە بە ئاستەم دیار بوو. لە پاش تێپەڕبوونی دوایین ئەربە۲؛ پێیەك بەفری تر باریبوو. کابرا خۆشحاڵ بوو کە ئەربەی پێنییە و باری سووکە. لە ڕاستیدا جگە لە ژەمی ناو دەستەسڕەکە، هیچی تری پێنەبوو. بەڵام لەو سەرمایە حەپەسابوو. دەستی لە لووت و گۆنا سڕبووەکانی خۆی دەخشاند و گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هەر بە ڕاستی ساردە. پیاوەکە ڕیش و سمێڵێکی پڕی هەبوو، بەڵام ڕیش و سمێڵ دادی گۆنا و ئەو کەپووە بڵندەی نەدەدا، کە سەرسەختانە بە ڕووی ئەو هەوا ساردەدا قوت بووبووەوە.

کابرا سەگێکی گەورەی کوڵك خۆڵەمێشیی ئەسکیمۆی تایبەت بە ناوچەکەی لەگەڵدا بوو، کە کتومت هەر لە گورگ دەچوو. سەگەکە بەو سەرما بڕندەیە پەست و بێزار بوو، دەیزانی کات کاتی ڕێڕۆیشتن نییە. غەریزەی سەگەکە شتێکی ڕاستتری لە سەلیقەی پیاوەکە دەگوت. لە ڕاستیدا پلەی گەرما نەك لە پەنجا پلەی ژێر سفر، بەڵکو لە شەست پلەی ژێر سفر و حەفتا پلەی ژێر سفریش ساردتر بوو. حەفتاوپێنج پلەی ژێر سفر بوو. ئاخر سیودوو پلەی سەروو سفر پلەی بە شەختەبوونە، حەفتاوپێنج پلەی ژێر سفر واتا سەدوحەوت پلەی بە شەختەبوون. سەگەکە هیچی لەبارەی گەرماپێوەوە نەدەزانی.

بە پێچەوانەی زەینی پیاوەکەوە، ڕەنگبێ لە زەینی ئەودا یادەوەریی سەرمایەکی وەها بوونی نەبووبێ، بەڵام ئاژەڵان غەریزەیان هەن! بۆیە سەگەکە هەستی بە ترس و نیگەرانییەکی نادیار، بەڵام مەترسیدار دەکرد. لە نزیك پێوپلی پیاوەکەوە بە ئەسپایی و بە پارێزەوە دەڕۆیشت و لە هەر جوڵەیەکی نارێکی پیاوەکە ڕادەما؛ وەك ئەوەی چاوەڕێی ئەوە بێت کابرا لە ڕۆیشتن بوەستێت و بچێتە پەناگەیەکەوە و ئاگر بکاتەوە. سەگەکە دەیزانی ئاگر چییە، ئاگری دەویست. ئەگەریش نا، دەیویست خۆی لەژێر بەفرەکەوە کرژ بکات و دوور لە هەوا، لە گەرمایی گیانی خۆیدا هەڵبکورمێ.

هەڵمی هەناسەی سەگەکە بەستبووی و وەك وردە کریستاڵ بە فەرووەکەیەوە نیشتبوو. بەتایبەت دەوری لمۆز و برژانگەکانی تەواو سپی هەڵگەڕابوون. ڕیش و سمێڵی سووری پیاوەکەش زوقمیان کردبوو، بەڵام ئەمیان زۆر ڕەقتر دیار و زیاتر بە وردەسەهۆڵ دەچوو؛ لەگەڵ هەر هەناسەیەکی تەڕ و گەرمیشدا توێژاڵێکی تری لەسەر دەنیشت. پیاوەکە تۆباکۆی دەجوو، ئەو لمۆزەی لە سەهۆڵ

بۆی دروست بووبوو؛ لچ و لێوی وەها کلۆم دابوو، کە نەیدەتوانی ئەو لیکە لە بەرچەناگەی بسڕێ، کە دەیتفاندەوە. دواجار وردەوردە ڕیشێکی درێژکۆلە لە کریستاڵی زەرد وەك چلوورە بە چەناگەیدا شۆڕ بووەوە. ئەگەر بکەوتایە بە دەمدا، ئەوا ڕیشە کریستاڵەکەی وەك شووشە دەشکا و دەبووە هەزار پارچەی تیژەوە. بەڵام کابرا گوێی بەو لمۆزە زیادەیە نەدەدا، کە بە دەم و ڕیشییەوە دروست ببوو. ئەوە عاقیبەتی هەموو ئەو کەسانە بوو، کە تۆباکۆیان دەجوو. پیاوەکە دوو سەرمای گەورەی تری تێپەڕاندبوون، بەڵام هیچیان هێندەی ئەمە سارد نەبوون، ئەو جارانەی پێشوو سەرما لە پەنجا یان پەنجاوپێنج پلەی ژێر سفریان تێنەپەڕاندبوو.

چەند میلێکی تریش بە ژێر درەختەکاندا ڕۆیشت، ناوچەی قولەڕەشەکانیشی تێپەڕاند و بەرەو ڕۆخی چەمێکی شەختەبەند شۆڕ بووەوە. ئەمە چەمی هێندەرسن بوو. پیاوەکە دەیزانی ئیدی لێرەوە تا دووڕییانەکە دە میلی ماوە. تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد. سەعات دە بوو. لە هەر سەعاتێکدا چوار میل ڕۆیشتبوو. حیسابی کرد کە بەم خێراییە سەعات دوازدەونیو دەگاتە دووڕییانەکە. بڕیاری دا هەر بە خۆشیی ئەم مەزەندە نایابەوە لەوێدا نانی نیوەڕۆ بخوات.

سەگەکەش لەبەر پێیدا کەوت و بە ئاماژەی نائومێدی کلکی ڕووەو زەوی کلافە کرد. جێ خەرماشەی ئەربەی بەفر کە پێشتر بەوێدا ڕۆیشتبوون، گەرچیی دوازدە ئینچ بەفریشی بەسەردا باریبوو، بە باشیی دیار بوو. پێدەچوو مانگێك بێ کەس بەوێدا نەڕۆیشتبێ. پیاوەکە سەرسەختانە لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو. کاتێکی وای نەدەدا بە خۆی بیر بکاتەوە، جگە لەوەی کە بەتەما بوو لە دووڕییانەکە نانێك بخوا و سەعات شەش بگاتە کەمپ لای کوڕەکان، چ شتێکی ئەوتۆی نەبوو بیری لێبکاتەوە. کەس نەبوو تا قسانی لەگەڵ بکا، ئەگەریش هەبوایە، قسەکردن بەو دەموپلە بەستوویەوە ئەستەم بوو. ئیدی لۆژەلۆژ بەردەوام بوو لە جوینی تۆباکۆ و درێژکردنەوەی دەموپلە ڕەنگ عەنبەرییەکەی.



جار نا جارێك بە بیریدا دەهات کە ئێجگار ساردە و هەرگیز پێشتر سەرمای وای نەبینیوە. زوو زوو گۆنا و سەرلووتی بە پشتی دەستکێشەکانی گەرم دەکردنەوە. ئەمەی خۆبەخۆ هەر جارە و بە دەستێکی دەکرد. بەڵام هەرچی چەندێك دەستی لە گۆنای دەخشاند؛ چرکەیەك دواتر دەیبەست و چرکەی دواتر لووتی سڕ دەبوو. سوور دەیزانی بەفر گۆناکانی دەبا. پەنجەی پەشیمانیی دەگەست لەوەی نەیکردووە لووتبەستێك ببەستێت. ئاخر ئەو لووتبەستە گۆنای

لەو سەرمایە دەپاراست. بەڵام قەیدی ناکا، کەمێ بەئازارە و هیچی تر؛ هەر ئەوەیە، خۆ شتێکی جیددی نییە.
ڕاستە مێشکی خاڵی بوو لە بیرکردنەوە، بەڵام وردبین بوو، ورد تەماشای گۆڕانکارییەکانی دەوری چەمەکەی دەکرد و ورد ڕەچاوی ئەوەی دەکرد، کە بۆ هەر هەنگاوێك پێ لە کوێدا دابنێ. جارێك لە پێچێکدا، وەك ئەسپێکی ترساو سڵەمییەوە و چەند هەنگاوێك بەرەو دواوە کشایەوە. دەیزانی چەمەکە تا بنەوە بەستوویەتی، لە زستانی باکووری باکووردا هیچ چەمێك نییە نەیبەستێ، بەڵام دەشیزانی کانیاو هەن لە گردەکانەوە تەقیون و بە ژێر بەفرەکەدا دێن. دەیزانی لە ساردترین سەرمادا ئەم کانیاوانە نایانبەستێ و لە خەتەرناکییان ئاگاداربوو. ئەو کانیاوانە وەك تەڵە وابوون. ئەستێڵکێك ئاو بە قووڵیی چەند ئینجێك لەژێر بەفرەکەدا کۆ دەبووەوە. هەندێ جار توێژاڵێك شەختە لەژێر بەفرەکەوە بوو. هەندێ جار چەند توێژاڵێك لە ئاو و شەختە و بەفر دووبارە دەبوونەوە و کە یەکێکیان دەشکا؛ ئەوانی تریش بە دوایدا دەشکان و ئیدی بنیادەم تا نێوقەد لە ئاودا ڕۆدەچوو.
بۆیە بەو شێوەیە لەو هەنگاوهەڵێنانەی پرنگایەوە. هەستی بە خلیسکیی ژێر پێی دەکرد و لەژێر بەفرەکەدا گوێی لە قرچەی شکانی سەهۆڵ بوو. ئەگەر لەو سەرمایەدا پێی تەڕ بوایە؛ ئەوا تووشی کێشە و مەترسی دەبوو. لایەنی کەم دوا دەکەوت، چونکە دەبوو بوەستێ و ئاگر بکاتەوە تا گۆرەوی و پووتەکانی وشك بکاتەوە. کەمێك ڕاوەستا و لە چەمەکە ڕاما، مەزەندەی کرد ئاوەکە لە لای ڕاستەوە بێت. کەمێکی تر ڕاما و لووت و گۆنای گەرم کردەوە و بەرەو لای چەپ ڕێی کرد. بە پارێزەوە هەنگاوی دەنا و پێش هەر هەنگاوێك جێی پێدانانی تاقی دەکردەوە. کە لە مەترسی دەربازی بوو، ئەوسا مشتێ تۆباکۆی تازەی نایە دەمی و ئاوڕێکی لەو چوار میلەی کە بڕیبووی، دایەوە.
لە ماوەی دوو سەعاتی داهاتوودا تووشی چەند دانەیەکی تر لەو داوانە بوو. زۆربەی کات بەفری سەر ئەو ئاوانە بە جۆرێك لە جۆرەکان سافتر و نزمتر لە ئەرزەکە نیشتبوون و مەترسییەکەیان ئاشکرا دەکرد. جارێکی تریش خەریك بوو تێی بکەوێت. بەڵام لەوەودوا ئیتر سەگەکەی لە پێش خۆیەوە ڕەوانە دەکرد. سەگەکە نەیدەویست لە پێشییەوە بڕوات، لە دواوە دەرۆیشت، بەڵام پیاوەکە

پاڵی پێوە دەنایە پێش خۆی، ئەوجا سەگەکە بە پرتاو بەسەر بەفرەکەدا ڕای دەکرد. لەپڕ شەختە لەژێر پێیدا دەشکا و ڕای دەکردە ئەو لایەی کە بەفرەکەی ڕەقتر بوو. قاچەکانی پێشەوەی تەڕ دەبوون و هەر زوو ئاوەکە بە پێیەکانیەوە دەیبەست. خێراخێرا زمانی بە بەفرەکەی قاچیدا دەهێنا تا بیتوێنێتەوە؛ لە بەفرەکەدا چیچکەی کرد و کەوتە گازگرتن و شکاندنی ئەو ئاوەی بە قاچیەوە بووبووە شەختە. ئەمەی بە غەریزە دەکرد. ئاخر ئەگەر لێگەڕایە بەفرەکە بە قاچییەوە بمایە؛ ئەوا دەبووە مایەی ئازار. سەگەکە ئەمەی نەدەزانی؛ بەڵکو زۆر سادەوساکار گوێڕایەڵیی ئەو بزواندنە پەنهانانەی دەکرد، کە لە قوڵایی بوونییەوە هەڵدەقوڵین. بەڵام پیاوەکە دەیزانی و دەستکێشەکەی دەستی ڕاستی داکەند و کەوتە لێکردنەوەی پارچەشەختە لە خۆی. خولەکێك زیاتری پێنەچوو دەستکێشەکەی کردەوە دەستی و واقی لە سڕبوونی ناکاوی دەستی وڕ ما. هەر بە ڕاستی سارد بوو. زووبەزوو دەستکێشەکەی کردەوە دەستی و دەستوپلە سڕبووەکەی بە سنگیدا کوتا.

ڕووناکترین کات سەعات دوازدە بوو. بەڵام خۆر هێند دوور بوو؛ نەیدەتوانی ئاسۆ ڕووناك بکاتەوە. هەر بۆیە پیاوەکە بەو نیوەڕۆ ساماڵە چ سێبەرێکی نەبوو. سەعات دوازدەونیوی ڕێك پیاوەکە گەیشتە دووڕێیانی چەمەکە. دڵخۆش بوو بەوەی لە کاتی خۆیدا گەیشتووە. ئەگەر بە هەمان ئەو خێراییە بەردەوام با، ئەوا بە دڵنیاییەوە سەعات شەش لای کوڕەکان دەبوو. قۆپچەی چاکەت و کراسەکەی کردنەوە و خواردنەکەی دەرهێنا. بە هەمووی چارەکە خولەکێکی پێنەچوو؛ کەچی هەستی بە سڕبوونی پەنجەکانی و ئەو شوێنانەی کرد، کە دانەپۆشرابوون. دەستکێشەکانی لە دەست دانەکەندن، بەڵام بۆ خۆگەرمکردنەوە چەند جارێك توند پەنجەکانی بە لاڕانیدا کێشا. لەسەر کۆتەرەدارێکی بە بەفرپۆشراو دانیشت تا چۆرەکەکەی بخوات. دەستی هێند زوو دەرچی؛ فریا نەدەکەوت گەرمی بکاتەوە؛ گازێکی لە چۆرەکەکە دەگرت و دەستی بە لاڕانیدا تا سڕ نەبێت، دەکێشایەوە، گازێکی تری لە چۆرەکەکە دەگرت و ئەو دەستەی تری گەرم دەکردەوە، کە چۆرەکەکەی پێگرتبوو. ویستی قەپێکی گەورەی لێبدات، بەڵام لەبەر دەموپلە شەختەبووەکەی نەیدەتوانی دەم بکاتەوە. ئەقڵی پێنەدەشکا ئاگرێك بکاتەوە تا سەهۆڵی گیان و دەموپلی بتوێنێتەوە. پێکەنینی بە گەمژەیی خۆی هات و هەستی بە سڕبوونی زیاتری پەنجەکانی دەکرد. کاتێ یەکەم جار دانیشت؛ هەستی دەکرد چیدی ئاگای لە کەسیرەیی پەنجەکانی پێوپلیشی نییە. نەیدەزانی ئاخۆ گەرمیان بووەتەوە یان ئەوانیش سڕ بوون.





پەنجەکانی لە ناو پووتەکاندا جولاندن و بۆی دەرکەوت کە سڕ بوون.
هەر زوو دەستکێشەکانی کردنەوە دەست و هەستایە سەر پێ. کەمێك ترسی لێنیشت. چەند جارێك قاچی کوتا بە ئەرزەکەدا تا ئازاری تێبێتەوە. دیسان وەبیری هاتەوە کە هەر بە ڕاستی ساردە. ئەو پیاوەی لە چەمی گۆگرد باسی سەرماکەی بۆ کردبوو، ڕاستی گوتبوو. ئەم ئەوسا پێی پێکەنیبوو! مرۆڤ نابێ زۆر لە شت دڵنیا بێت. چ گومانێکی تێدا نەبوو، سارد بوو.
پیاوەکە دەهات و دەچوو، قاچی بە ئەرزەکەدا دەکوتا و قۆڵی ڕادەوەشاند تا هەستی کرد کەمێك گەرماییان تێگەڕاوە. ئەوسا شخارتەی دەرهێنا تا ئاگرێك بکاتەوە؛ لە بن دارەکانەوە چیلکە و چوێڵ، کە ئاوی بەهاری پێشوو لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی، کۆ کردەوە.
لە ئاگرێکی بچووکەوە دەستی پێکرد و هەرزوو ئاگرێکی گەورەی خۆش کرد. لە بەر ئاگرەکەدا بەفری دەموچاوی دەتوایەوە و چۆرەکەکەشی خوارد. بۆ ساتێك گرەوی لە سەرما بردەوە. سەگەکەش ئاگرەکەی پێخۆش بوو، بەشی ئەوە لێی نزیك بووبووەوە کە گەرمی بێتەوە و بەشی ئەوەش خۆی دوور گرتبوو، کە نەسووتێ.
کە کابرا لە ئاگرکردنەوە بووەوە، پایپەکەی دەرهێنا و بە کەماڵی ئیسراحەت کێشای.
دواتر دەستکێشەکانی لە دەست کردنەوە، کڵاوەکەی بەسەر گوێچکەکانیدا دادایەوە و ئاڕاستەی لای چەپی دووڕێیانەکەی گرتە بەر. سەگەکە پێی خۆش نەبوو هەستێ و بەرەو ئاگرەکە خۆی کێشایەوە. ئەم پیاوە نازانێت سەرما چییە. ڕەنگبێ هەموو نەوەکانی باووباپیرانیشی نەیانزانیبێ سەرما چییە؛ سەرمای ڕاستەقینە، سەرمای سەدوحەوت پلەی ژێر سفر. بەڵام سەگەکە دەیزانی؛ باووباپیرانیشی دەیانزانی و ئەمیش لەوانەوە دەیزانی. دەیزانی کە ڕۆیشتن لە سەرمایەکی ئاوها ترسناکدا عاقیبەتی باش نییە. لە سەرمایەکی وادا دەبێ خۆت بخزێنیتە کونێك لەژێر بەفرەوە و جێیەکی گەرم بۆ خۆت خۆش بکەیت و چاوەڕێ بکەیت تا هەور ڕووی ئاسمان دەپۆشێت. لە لایەکی تریشەوە، هۆگرییەکی تەواوەتی لە نێوان سەگەکە و پیاوەکەدا هەبوو.
سەگەکە کۆیلە و ڕەنجبەری پیاوەکە بوو، تاکە نەوازش کە کرابێت، بە قامچی بووە، یان ئەو نەڕەنەڕانە بووە، کە هەڕەشەی هێنانی قامچییان پێبووە. بۆیە سەگەکە چ هەوڵێکی نەدەدا ترسی خۆی پیشانی پیاوەکە بدات. ئەو خەمی پیاوەکەی نەبوو؛ لەبەر خاتری خۆی بوو کە دەیویست لای

ئاگرەکەوە بمێنێتەوە. بەڵام کابرا فیکەی بۆ لێدا و بە دەنگی قامچی بانگی کرد، سەگەکەش بەرەو لای ڕای کرد.
پیاوەکە هەندێ تۆباکۆی تری نایە نێو دەمی و ڕیشێکی ڕەنگ عەنبەریی تری بۆ دروست دەبووەوە. شێی هەناسەی هەر زوو وەك تۆزێکی سپیی بەفر لە سمێڵ و برۆ و برژانگەکانی دەنیشت. لەوە نەدەچوو لەم ڕێیەدا کانیاو هەبن، نزیکەی نیو سەعاتێك دەبوو هیچ کانیاوێك نەهاتبووە ڕێگەی. بەڵام لەناکاو؛ لە شوێنێکدا کە هیچ ئاماژەیەك نەبوو بۆ بوونی کانیاو و پێدەچوو ژێری بەفرە سپییەکە وشك بێت؛ کەوتە کانیاوێکەوە. کانیاوەکە قووڵ نەبوو. کە پێی نایەوە وشکانی، تا سەرئەژنۆی تەڕ بووبوو.
تووڕە بوو، نەفرەتی لە بەختی خۆی دەکرد. بە ئومێد بوو سەعات شەش لای کوڕەکان بێت لە کامپ، بەڵام ئەمە نزیکەی سەعاتێکی تر ماتڵی دەکرد، چونکە دەبوو ئاگر بکاتەوە و پووت و پێوپلی وشك بکاتەوە. دەبوو لەو سەرمایەدا ئەوە بکات. ئاوڕی بۆ بەرزایی ڕۆخی چەمەکە دایەوە و سەرنجی دا لە بن دارەکانەوە چڵوچێوی وشك هەن، کە بەهاری پێشوو ئاو تا بەرزاییەکانی هێنابوون. چەند پارچەیەکی گەورەی لێ فڕێ دانە سەر بەفرەکە تا ئاگرەکە لە بنەوەڕا هەڵایسێنێت. ئاگری تەڵە شخارتەکەی بە تەلاشە دارێکەوە نا، کە لە گیرفانیدا هەڵیگرتبوو و پاشان خستییە سەر پارچە دارە گەورەکانی بنەوە و ئاگرە بچووکەکەی بە گژوگیا خۆش کرد.
بە کاوەخۆ و بە وریاییەوە خەریکی ئاگرەکە بوو، باش دەیزانی یەخەگیری چ مەترسییەکە. تا ئاگرەکە خۆشتر دەبوو، ئەمیش وشکە گژوگیای زیاتری دەرخوارد دەدا. دادەنەوییەوە و چڵوچێوی تری لە بن دەوەنەکانەوە دەردەهێنا. دەیزانی نابێت هیچ هەڵەیەك بکات. کە پلەی گەرما بگاتە حەفتا ژێر سفر، ئیدی پیاو نابێت هیچ هەڵەیەك لە کردنەوەی ئاگردا بکات. ئەگەر بە لاقی وشکەوە هەڵەیەك بکات، دەتوانێت نیوە میلێك بە پێ بڕوات تا هەست و خوێن دەگەڕێنێتەوە بۆ گیانی. بەڵام هەرچی چەندێکیش ڕابکات؛ هەست و خوێن ناگەڕێنەوە بۆ پێوپلێك کە تەڕ بووبن و بووبنە شەختە. تا خێراتر ڕابکات، زیاتر پێوپلە تەڕەکەی دەیبەستێ.
پیاوەکە هەموو ئەوانەی دەزانین. پاییزی پێشوو پیرەکەی چەمی گۆگرد لەبارەی سەرمای لەم جۆرەوە ئامۆژگاریی کردبوو، ئەم ئێستا قەدری ئەو قسانەی دەزانین. ئێستا چیتر هیچ هەستێك لە قاچیدا نەمابوو. تا ئاگرەکە بکاتەوە، پێویستی کردبوو دەستکێشەکانی دابکەنێت، بۆیە زوو پەنجەکانی سڕ ببوون. بە هۆی ڕۆیشتنەوە دڵی توانیبووی خوێن لە هەموو ئەندامەکانی



جەستەیدا بسووڕێنێ، بەڵام هەر کە لە ڕۆیشتن کەوت، لێدانی دڵیشی خاو بووەوە. سەرمای گەردوون زەبری خۆی لەو سەرەنووکەی زەوی دەوەشاند، کە بێ بەرگری مابوو، ئەمیش کە بۆ نەگبەتی لەو بەشەی زەویدا بوو، تەواوی ئەو زەبرەی بەردەکەوت. بەر لە خۆی، خوێنی جەستەی خۆی لە گیانیدا لوول کرد و شاردەوە. خوێنەکە زیندوو بوو، ئەمیش وەك سەگەکە دەیویست خۆی لە سەرما حەشار بدات. گەر لە سەعاتێکدا چوار میل ڕۆیشتبا؛ ئەوا خوێن، گەرچی بە خاوەخاویش بێت، دەگەیشتە ڕووکاری جەستەی. بەڵام ئێستا خوێن کشابووەوە بۆ قووڵاییەکانی جەستەی. یەکەمین شت دەستوپێی بوو، کە هەستی بە دابڕانی خوێن تیایدا دەکرد. سەرما پێوپلە تەڕەکەی دەبرد و پەنجە ڕووتەکانیشی دەڕچین. سەرما لووت و گۆنای دەبرد و پێستی جەستەی لەگەڵ نەمانی خوێن تیایدا، دەتەزی.



بەڵام خۆی سەلامەت بوو. سەرما تەنها پەنجەی پێ و لووت و گۆنای دەبرد، چونکە ئاگرەکە بە تین دەسووتا. ئێستا چیلکە و چوێڵی گەورەی، بە ئەستوورایی پەنجەی خۆی، تێدەخست. هەر دەقیقەیەکی تر و ئیدی دەیتوانی داری ئەستووری هێندەی مەچەکی خۆی بسووتێنێ. ئەوسا دەیتوانی جلکە تەڕەکانی دابکەنێت و تا وشك دەبێتەوە؛ خۆیشی لەبەر ئاگرەکەدا گەرم بکاتەوە. ئاگرەکە سەرکەوتنێك بوو. ئەم سەلامەت بوو. ئامۆژگاریی پیرەکەی چەمی گۆگردی بیر هاتەوە و زەردەی هاتێ. پیرەکە زۆر جیددییانە کردبوویە یاسا کە هیچ پیاوێك نابێ لە کلۆندایك بە تەنیا لە سەرمای ژێر پەنجادا سەفەر بکات. دەی خۆ وا ئەم سەفەری دەکرد، ڕووداوێکیشی لێ ڕوویداوە؛ بە تەنیایشە؛ خۆیشی ڕزگار کردووە. پێی وابوو ئەو پیرانە، هەندێکیان، نەختێ ترسنۆکن. پیاو هەر هێندە بتوانێت ئارام بگرێت، ئیدی هیچی لێنایەت. پیاوێك پیاو بێ، دەتوانێ بە تەنیا سەفەر بکات. بەڵام سەری سووڕ مابوو کە ئاوها بە خێرایی ڕوومەت و لووتی دەبوونە شەختە. باوەڕی نەدەکرد کە پەنجەکانیشی وا زوو سڕ ببن. هەر بە ڕاستی گەرمایان تێدا نەمابوو، بە ئاستەم دەیتوانی بیانجوڵێنێت و چیلکەیەکیان پێبگرێت. دەستی دوور لە خۆی و لە جەستەی وەدیار دەکەوت. کاتێ دەستی لە چیلکەیەکەوە دەدا، دەبوو تەماشا بکات و بزانێت ئاخۆ گرتوویەتی یان نا. دەمارەکانی نێوان خۆی و سەری پەنجەکانی پچڕابوون.

ئەمانە هیچی جێی خەمێکی ئەوتۆ نەبوون. گرنگ ئاگرەکە بوو. قرچەقرچ دەسووتا و هەر بڵێسەیەکی کە سەمای دەکرد، پەیمانی بەردەوامیی ژیانی دەدا. کابرا کەوتە کردنەوەی پووتەکانی. یەکپارچە سەهۆڵ بوون؛ گۆرەوییە ئەستوورە ئەڵمانییەکانی تا سەر ئەژنۆی وەك ئاسن ڕەق ببوو؛ قەیتانی پووتەکانی وەك ئەوە وابوو تووڵی پۆڵا بووبن و بە ئاگری کوورە بە کونی پووتەکانییەوە توابنەوە و لوولیان خواردبێ. کەمێك بە پەنجە سڕەکانی خەریکیان بوو، بەڵام کە لە بێئەنجامییەکەی دڵنیا بوو، ئەوسا چەقۆکەی دەرکێشا.

بەڵام پێش ئەوەی قەیتانەکانی بپچڕێنێ، ئاگرەکە کوژایەوە. خەتای خۆی، یان ڕاستتر بڵێین، هەڵەی خۆی بوو. نەدەبوو لەژێر سنەوبەرەکەدا ئاگرەکەی بکردایەتەوە. دەبوو لە جێیەکی کراوە و بەرفراواندا بیکردایەتەوە. بەڵام ئاسانتر بوو ڕاستەوخۆ چیلکە لە بن سنەوبەرەکەوە بهێنێت و یەکسەر فڕێیان بدەیتە ناو ئاگرەکەوە. ئەو دەرختەی ئەم ئاگرەکەی لەژێردا کردبوووەوە، تۆپەڵە بەفر لەسەر هەر پەلکێکی نیشتبوو. چەندین هەفتە بوو با نەیخستبوو. هەر پەلکێك لەژێر کێشی بەفردا نەوی بوو. هەر جارێك چیلکەیەکی لە بن دارەکەوە دەرهێنا بوو، کەمێك دارەکەی لەراندبوو- لەرەیەکی هەستپێنەکراو، بەڵام لەرەیەك بەشی ئەوە بکا کارەساتەکە بخوڵقێنێ. بەفری دوایین پەلکی درەختەکە کەوت بەسەر پەلکەکەی ژێریدا و ئەویش بەسەر ئەوەی ژێر خۆیدا، تا هەموو درەختەکەی گرتەوە و وەك هەرەس و لەناکاوێکدا کەوت بەسەر پیاوەکە و ئاگرەکەدا. ئاگرەکە ئەسەری نەما! ئێستا لەجێی ئاگرەکە تۆپەڵێ بەفری تازەی زبر و نارێك کەوتبوو.

کابرا شۆك بوو. وەك ئەوەی گوێی لە بڕیاری بە مردن سزادانی خۆی بووبێت. بۆ ساتێك وەستا و لەو جێیە ڕاما، کە ئاگرەکەی لێکردبووەوە. ئەوسا ئارام بووەوە. ڕەنگبێ پیرەکەی چەمی گۆگرد ڕاستی کردبێ. ئەگەر هاوسەفەرێکی لەگەڵدا با، ئەوا ئێستا لە مەترسیدا نەدەبوو. هاوسەفەرەکەی ئاگرێکی دەکردەوە. تازە دەبوو ئەم خۆی ئاگرێکی تر بکاتەوە و ئەمجارەیان نابێت هەڵەی تێدا بکات. تەنانەت ئەگەر سەرکەوتووش بێت، چەند پەنجەیەکی پێی لە دەست دەدات. پێوپلی خەراپ ڕچیبوون و تا ئاگری دووەمیشی دەکردە، وەك کاتی دەویست.





ئەمە خایلەگەلی ئەو بوون، بەڵام ئەو دانەنیشتبوو بیریان لێبکاتەوە. ئەم خایلانە بە مێشکیدا دەهاتن و دەچوون لە کاتێکدا کە ئەم مژوڵی دانانی کۆتەرەدار بوو بۆ بن ئاگری دووەم. ئەم جارەیان لە شوێنێکی کراوەدا، کە



هیچ دارێك نەتوانێت بیکوژێنێتەوە. دواتر پووش و پەڵاش و چیلکەی لە پاشماوەی ڕووبارەکەوە هێنا. نەیدەتوانی بە پەنجە لێکیان جیا بکاتەوە، بەڵکو بە چنگ و بە تۆپەڵ دەیهێنان. بەم جۆرەش گەلێك چیلکەی ڕزیو و قەوزەی تەڕی لەگەڵ تۆپەڵەکەدا بە دەستەوە دەهاتن، کە چ کەڵکێکیان بۆ ئاگرکردنەوە نەبوو. ئەو بە میتۆد ئیشی دەکرد، تەنانەت لقی گەورەشی دەهێنا بۆ پاش خۆشبوونی ئاگرەکە. بە درێژایی کات سەگەکە دانیشتبوو تەماشای پیاوەکەی دەکرد. جۆرێك مەیلی ئومێد لە چاوانیدا بوون؛ وەك ئاگربەخشێك تەماشای پیاوەکەی دەکرد. بەڵام ئاگرەکە بە کاوەخۆ دەگەشایەوە.

کە هەموو شت ئامادە بوو، پیاوەکە دەستی برد بۆ گیرفانی تا پارچەیەکی تر لە تەڵاشە دارە وشکەکە دەربهێنێت. هەرچەند نەیدەتوانی بە پەنجە هەستی پێبکات؛ بەڵام دەیزانی تەڵاشە دارەکەی پێیە. کە بۆی دەگەڕا، گوێی لە خشوهوڕی بوو. هەرچەند تەقەللای لەگەڵ دا، نەیتوانی بە دەست بیگرێت. دەشیزانی هەر چرکەیەك کە دەڕوات، قاچی زیاتر دەیبەستێ. ئەم خایلەیە تۆقاندبووی، بەڵام هەوڵی دا بیری لێنەکاتەوە و خۆی ئارام کردەوە. دەستکێشەکانی بە دان لە دەستی داکەندن و تا هێزی تیا بوو قۆڵی بە کەلەکەیدا کێشا. بە دانیشتن و بە ڕاوەستانەوە هەمان شتی دووبارە کردەوە. سەگەکەش لە بەفرەکەدا چیچکەی کردبوو؛ کلکە گورگئاساکەی بەسەر قاچیدا گەرم داهێنابوو. گوێچکە قوتەکانیشی وریایانە ڕووەو پیاوەکە هەڵبڕیبوون. پیاوەکە کە خەریکی قۆڵ و باڵ وەشاندن بوو، ئیرەییەکی زۆر بەرانبەر سەگەکە دایگرت کە بۆ خۆی گەرموگوڕ لەو بەفرەدا لە نێو فەرووی سروشتیی خۆیدا لێی دانیشتووە.

پاش ماوەیەك لە یەکەمین ئاماژەی گەڕانەوەی هەست بۆ پەنجەکانی هۆشی هاتەوە. هەستی کرد باسکی مێرووله ئەکات، دواتر بووە ئازارێکی بەسوێ، پیاوەکە بەوە شاگەشکە بوو. دەستکێشەکەی لە دەستی ڕاستی داکەند و تەڵاشە دارەکەی دەرهێنا. زووبەزوو پەنجە ڕووتەکانی سڕ بوونەوە. ئینجا شخارتە گۆگردەکانی دەرهێنان. بەڵام سەرما ژیانی لە پەنجەکانیدا نەهێشتبوو. لە هەوڵدانیدا بۆ جیاکردنەوەی تەڵێك شخارتە لەوانی تر، هەمووی لێ کەوتنە خوارەوە. ویستی لە بەفرەکەدا هەڵیان بگرێتەوە بەڵام بێهوودە بوو. پەنجە مردووەکانی نەیاندەتوانی، نە گۆیان

دەکرد و نە هیچیان پێدەگیرا. کابرا زۆر بەئاگا بوو. ڕێی بە خۆی نەدەدا بیر لە سڕبوونی لاق و لووت و ڕوومەتی بکاتەوە. بوونی خۆی بۆ تەڵەشخارتەکان تەرخان کردبوو. لە بری هەستی دەستلێدان؛ پشتی بە بینین بەستبوو. کە دەیبینی پەنجەکانی دەوری کۆمەڵێك تەڵەشخارتەیان داوە؛ دەنووقان – هەر نەبێ هەوڵی دەدا بیاننوقێنێ، چونکە پەنجەکانی فەرمانیان پێنەدەگەیشت. دەستکێشەکەی کردەوە دەستی ڕاستی و بە ئەژنۆیدا کێشا. ئەوسا بە هەردوو دەستی تەڵەشخارتەکانی بە کۆمەڵ بە تۆپەڵێك بەفرەوە بۆ ناو کۆشی هەڵگرتنەوە.
پاش ماوەیەك هەوڵدان توانیی تەڵەشخارتەکان بخاتە سەر لەپی دەستی و بە دەم بیانگرێت. تەقەلای دا دەمیش بکاتەوە و سەهۆڵ و شەختەی دەمولێویشی بشکێنێ. بە لێو تەڵە شخارتەیەکی لە تەڵەکانی تر جیا کردەوە. لێی کەوتە ناو کۆشی و نەیتوانی هەڵیبگرێتەوە. ئەم جارە بە شێوەیەکی تر هەوڵی دا. بە ددان هەڵیگرتەوە و هێنای بە لاڕانیدا. بیست جار هێنای بە لاڕانیدا تا دایگیرساند. بە گڕەکەوە بە ددان گرتبووی و هەوڵی دەدا تەڵاشە دارەکەی پێ دابگیرسێنێت. بەڵام دووکەڵی گۆگردەکە چوو بە کونەلووت و سینگیدا و خستییە کۆکە و شخارتەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و لە بەفرەکەدا کوژایەوە.
لە ساتەوەختی نائومێدییەکی جڵەوکراودا بیری کەوتەوە پیرەکەی چەمی گۆگرد ڕاست دەکا کە وتبووی: لە پەنجا پلەی ژێر سفردا پیاو دەبێ لەگەڵ هاوسەفەرێکدا سەفەر بکات. دەستی کوتا، بەڵام چ هەستێکی تێ نەگەڕایەوە. لەپڕ دەستکێشەکانی بە ددان لە هەردوو دەستی داکەندن و تەڵە شخارتەکانی لە لەپی ڕووتی دەستی نان. ماسوولکەکانی قۆڵی هێشتا لە کار نەکەوتبوون و بە هۆیانەوە دەیتوانی تەڵە شخارتەکان توند بە مەچەك بگرێت و بە لاڕانیدا بیانهێنێت. هەر حەفتا تەڵەشخارتەکە گڕیان گرت. ڕووی وەرگێڕا تا بۆنی ناخۆشی گۆگردەگە نەچێت بە قوڕگیدا. لە کاتێکدا ئاگرەکەی دەنا بە تەڵاشە دارەکەوە، هەستی دەکرد جووڵە





دەکەویتەوە دەستی. بۆنی پێستی دەستی دەکرد کە دەسووتا. لەژێر پێستی دەستییەوە، لە قووڵاییەکانەوە هەستی بە ئازارێك دەکرد، کە تا دەهات بەسوێتر دەبوو. بەوەشەوە بەرگەی دەگرت و لەرزۆکانە ئاگرەکەی لە تەڵاشە دارەکە نزیك دەکردەوە. توێکڵەکەش زووبەزوو گڕی نەدەگرت، چونکە دەستی ڕووی لە گڕەکەی کردبوو.
دواجار نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ئازارەکە بگرێ و دەستی ڕاپسکاند. تەڵە شخارتەکان کەوتنە بەفرەکەوە. بەڵام توێکڵە دارەکە گڕی گرتبوو. وشکە



گژوگیا و چیلکەوچویڵی پێکەوە فڕێ دەدانە ناو ئاگرەکە. نەیدەتوانی لێکیان ببژێرێ و لە یەکیان جیا بکاتەوە، بۆیە لەگەڵ هەڵگرتنی چیلکەوچویڵەکەدا داری ڕزیو و قەوزەی تەڕیشی بە دەستەوە دەهاتن و چەندێك بۆی بکرایە، بە دان دەیقرتاندن. بە تامەزرۆییەکی سەیر و بە وریاییەوە لە ئاگرەکەی دەنۆڕی. ئاگر واتای ژیانی دەدا و نەدەبوو بکوژێتەوە. خوێن لە ڕووکاری جەستەی دەبڕا و بەرەو قووڵاییەکانی گیانی دەگەڕایەوە. مچوڕك بە گیانیدا دەهات. تۆپەڵێك قەوزەی گەورە کەوتە ناوەڕاستی ئاگرەکە. ویستی پەلەپیتکەیەکی لێبدا و لە ناو ئاگرەکەدا لای ببات، بەڵام بە هۆی مچوڕك و گیانی لەرزۆکییەوە پەلەپیتکەیەکی زیاد لە پێویست توندی لێدا و هاوسەنگیی ئاگرەکەی تێکدا. گڕەکە بڵاو بووەوە، هەوڵی دەدا کۆی بکاتەوە بەڵام لەبەر هەڵلەرزین و مچوڕك نەیدەتوانی. هەر چیلکەیەك لە جێی خۆی دووکەڵێکی لێ بەرز دەبووەوە و ئیدی ئاگرەکە کوژایەوە. ئاگرکەرەوەکە شکستی هێنا، خەمساردانە لە دەوروبەری خۆی دەنۆڕی و نیگای دەکەوتە سەر سەگەکە کە لەبەر پاشماوەی ئاگرە کوژاوەکە، لە بەفرەکەدا لە بەرامبەری دەرکەوتبوو، بە نۆرە قاچەکانی لەژێر قورسایی خۆیدا دەجولاند و جەستەی بێ هەدادان هەرجارە و بە لایەکدا دەخست.

بە بینینی سەگەکە بیرۆکەیەکی بۆ هات. بەسەرهاتی ئەو پیاوەی بیر کەوتەوە کە لە زریانێکدا گیر دەخوا؛ مانگایەك دەکوژێ و لە ژێریدا خۆی پەنا دەدا و بەو جۆرە خۆی لە مردن ڕزگار دەکا. ئەمیش بە نیاز بوو سەگەکە بکوژێت و دەستەکانی لە بن گەرمای کەلاکەکەیدا دابنێ تا هەستی تێبگەڕێتەوە. ئەوسا ئاگرێکی تری دەکردەوە. بانگی سەگەکەی بۆ لای خۆی کرد؛ بەڵام لە دەنگیدا نەوایەکی ترس هەبوو، کە ئاژەڵەکەی تۆقاند. ئاخر سەگەکە هەرگیز نەیبیستبوو پیاوەکە بەو جۆرە قسە بکات. شتێك لە ئارادا بوو، کە سەگەکە بە سروشتی غەریزەی، لێی خانەگومان بوو - نەیدەزانی چ جۆرە مەترسییەك، بەڵام لە شوێنێك و بە جۆرێك، لە ناخیدا هەستی بە نییەتپیسیی پیاوەکە دەکرد. گوێچکەکانی شۆڕ کردنەوە و پەل و لاقی زیاتر جوڵەیان تێکەوت و جەستەی توندتر و خێراتر بەملاولادا دەبرد، بەڵام بەرەوپیریی پیاوەکە نەچوو. پیاوەکە بە زگەخشکێ بەرەوە لای سەگەکە هات. ئەم جوڵە نائاساییە هێندەی تر سەگەکەی بەدگومان کرد و سەگەکە هێواش هێواش لەسەر لا پاشەوپاش گەڕایەوە دوا.

پیاوەکە بۆ ساتێك لە بەفرەکەدا کروشکەی کرد و هەوڵی دا ئارام بێت. بە ددان دەستکێشەکانی لە دەست داکەندن و هەستایە سەر پێ. تەماشای ئەرزەکەی کرد تا دڵنیا بێت لەوەی کە هەر بە ڕاستی بەپێوە ڕاوەستاوە، چونکە نەبوونی هەست لە پێوپلیدا، پەیوەندیی ئەوی بە ئەرزەوە پچڕیبوو. هەستانی پیاوەکە خەیاڵی خەراپی لای سەگەکە ڕەواندەوە؛ کاتێکیش پیاوەکە بە حیرس و نەوای گۆکردنێکی پڕ لە هەڕەشەی قامچی لێدانەوە، بانگی کرد، سەگەکە وەك خووی هەمیشەیی؛ دڵسۆزیی خۆی نیشان دا و بەرەو ڕووی چوو. کاتێك تەواو لێی نزیك بووەوە؛ پیاوەکە کۆنترۆڵی لە دەست دا و پەلاماری سەگەکەی دا، بەڵام ئێجگار سەری سووڕ ما لە بێهێزیی و بیبڕستیی دەست و بازووی، کە نەیدەتوانی بینوقێنێت و بینوشتێنێتەوە. بۆ ساتێك بیری چووبووەوە کە قۆڵی بەستوویەتی و بەردەوامیش دەیبەستێ. ئەمانە لە چاوتروکانێدا ڕوویان دا و پێش ئەوەی فریای ڕاکردن بکەوێت؛ باوەشی بە سەگەکەدا کرد و توند توند بە خۆیەوە نوساند، ئیدی بەو شێوەیە لە بەفرەکەدا دانیشت. سەگەکەش دەیقروسکاند و دانی ڕیچ دەکردەوە و هەوڵی دەدا خۆی لە باوەشی پیاوەکە وەدەرنێت.

کابراش لەوەندە زیاتر کە بە سەگەکەوە لە باوەشیدا دانیشێت، هیچی تری پێنەدەکرا. دەیزانی ناتوانێت سەگەکە بکوژێت. بەو دەست و بازووە بێهێزانەیەوە، نە دەیتوانی چەقۆکە لە کیفەکەی دەربهێنێت و نە دەشیتوانی لە سەگەکەی بوەشێنێت. سەگەکەی بەرەڵا کرد و ئەویش لە باوەشیدا فرتەی کرد. دە مەترێك لەولاوە هەڵوێستەی کرد و گوێیەکانی بۆ پێشەوە قوت کردنەوە و لە پیاوەکە ورد بووەوە. پیاوەکە سەیری خوارەوەی کرد تا دەستی ببینێتەوە؛ بینی دەستی بە قۆڵیەوە شۆڕ بوونەتەوە. پێی سەیر بوو کە بنیادەم بنۆڕێت بزانێت دەستی کوا. بۆ پێنج خولەك بێوچان دەستی بە خۆیدا کوتا تا کەمێ خوێن گەڕایەوە ڕووکاری جەستەی و مچوڕکەکانی نەمان. بەڵام دەستی هیچ هەستیان تێنەگەڕایەوە. هەستی دەکرد وەك دوو کێشی قورس بە قۆڵییەوە هەڵواسراون.

ترسێکی بێزەوەر و دڵڕەقانە لە مردن دایدەگرت. ئەم ترسە بەسوێتر بوو کاتێك پەیی بەوە برد کە چیدی مەسەلەکە تەنیا بەشەختەبوونی دەست و پەنجەکانی نییە؛ بەڵکو مەسەلەی مان و نەمانە و بەخت چیدی یارویاوەری نییە. ئەوە زراوی برد و لە حەژمەتا کوێرانە بەرەو تووڵەڕێیەکەی قەراغ چەمەکە ڕای کرد. ترسێکی وەها دایدەگرت، کە هەرگیز لە ژیانیدا ترسێکی ئاوهای بە چاوی خۆی نەبینیبوو. بە کاوەخۆ و بە پەلەکوتێ و هەڵتەك هەڵتەك



به بەفرەکەدا ڕۆیشت تا دیسان ڕۆخی چەمەکە و سپیدارە ڕووتەکان و ئاسمانی بینییەوە. دوای ڕاکردنەکە هەستی بە باشیی کرد و چیدی هەڵنەدەلەرزی. پێی وابوو ئەگەر بەردەوام بێت لە ڕاکردن؛ ئەوا ڕەنگبێ خوێن بۆ پێوپلی بگەڕێتەوە؛ ئەگەر زۆرتریش ڕابکات، ئەوا بۆی هەیە بگاتە کامپ لای کوڕەکان. بێگومان بەفر چەند قامکێکی دەست و پێ و چەند بەشێکی دەموچاوی دەبا؛ بەڵام کوڕەکان هەتوانیان دەکرد و ئەودوای جەستەیان دەپاراست. لە هەمان کاتیشدا خایلەیەکی تر لە کەللەی دەدا، کە ئەو هەرگیز ناگاتە کامپ و لای کوڕەکان؛ ئاخر ئەوان چەندین میل دوور بوون و ئەمیش بەفر پەیتا پەیتا پەنجەی دەبرد و ئەوەندەی نەدەخایاند ئازای ئەندامی دەبووە سەهۆڵ و ڕەق هەڵدەگەڕا. ئەم خایلەیەی لە دواوە دانا و ڕێگەی بە خۆی نەدەدا بیری لێبکاتەوە. هەندێ جار خایلەکە دەهاتەوە ڕیزی پێشەوەی بیرکردنەوەی و خۆی دەسەپاند کە ببیسترێ، بەڵام ئەم بۆ دواوە پاڵی پێوە دەنایەوە و بیری بە لای شتگەلی تردا دەبرد.

پێی سەیر بوو بەو پێوپلەوە، کە هێند بەستبووی، هەستی نەدەکرد کەی بەر زەوی دەکەون، توانیبێتی ڕابکات. دەتگوت بە سەروو ڕووی بەفرەکەوە و بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بە زەوییەوە هەبێت و وەك ئەوەی لە هەوادا بێ، ڕادەکات. بیری کەوتەوە کە جارێك لە جاران مێرکیورییەکی٣ باڵداری بینیبوو و بیری کردەوە ئاخۆ ئەویش هەمان ئەو هەستەی هەبووە کە بەسەر ڕووی زەویدا کشاوە.

تیۆریی ڕاکردنە بەردەوامەکەی تا دەگەیشتە کامپ، هەڵەیەکی تێدا بوو: ئەویش ئەوەبوو ئیرادە و گوڕی نەبوو. چەند جارێك سەرسمی دا و بەملاو بەولادا لار بووەوە و کووڕ بووەوە و دواجار کەوت. ویستی هەستێتەوە بەڵام نەیتوانی. بڕیاری دا دانیشێت و پشوو بدات، دواتریش تەنها هەر دەڕوات و ڕاناکات. کاتێ دانیشت و هەناسەی هێور بووەوە؛ هەستی کرد حاڵی باشە و گەرم داهاتووە. مچوڕك بە گیانیدا نەدەهات و هەستی دەکرد تەزوویەکی گەرما بە سینگ و پشتیدا دێت. بەڵام هەست بێ و لە لووت و گۆنایدا نەبوو. ڕاکردن لووت و گۆنا و دەست و پێی گەرم نەکردبووەوە. پێی وابوو بەشێکی زۆرتر لە دەست و پێی بووەتە شەختە و زیاتریش بەرەو ناوەڕاستی گیانی هەڵدەکشێ. هەوڵی دا ئەم خایلەیە لە مێشکی وەدەرنێ و بیر لە شتێکی



تر بکاتەوە؛ دەیزانی ئەوە چ ترس و زەندەقچوونێك لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. بەڵام خایلەکە هەر قوت دەبووەوە و بەردەوام خۆی بە بیرکردنەوەیدا دەکردەوە، تا شێوەی تەواوی جەستەی خۆی بە ڕەقەوەبوویی هاتە پێشچاو. ئەمە زۆری بۆ هێنا و کەوتەوە ڕاکردن. کاتێ خاو بووە و ڕۆیشتنی ئاسایی دەڕۆیشت، دیسان خایلەکە هاتەوە وێزەی و هەمدیس ئەمیش کەوتەوە ڕاکردن.

هەتا ئێستاش سەگەکە هەر لەگەڵیدا ڕای دەکرد. کاتێ پیاوەکە بۆ جاری دووەم کەوت، سەگەکە لە بەردەمیدا چیچکەی کرد و کلکی لە کلاڵفەوە نا و بە پارێزەوە دیقەتی لە کابرا دەدا. گەرمایی و دڵنیایی سەگەکە ئەمی تووڕە کرد و تێرتێر سەگەکەی بە نەفرەت کرد. ئەم جارەیان زۆر زووتر موچوڕك بە گیانیدا هات. خەریك بوو لەم جەنگەدا بە شەختەی دەدۆڕاند. لە هەموو لایەکەوە گیانی دەیبەست و دەبووە سەهۆڵ. لە ترسا کەوتەوە ڕاکردن بەڵام نەیتوانی لە سەد هەنگاوێك زیاتر ڕاکات، بە دەمدا کەوت. ئەمە دوایین ترس بوو لێی نیشت. هەناسەی هەڵکێشا و خۆی کۆنترۆڵ کرد. دانیشت و بیری لەوە کردەوە بە شکۆوە بەرەوپیریی مردن بچێت. بەڵام خۆی بەو شێوەیە نەهاتە پێشچاو. پێی وابوو وەك مریشکێکی سەربڕدراو زۆر ترسنۆکانە بە هەرچواردەوری خۆیدا دەخولێتەوە. پیاوەکە چیدی دەبووە پارچەیەك سەهۆڵ و باشتر وابوو بە کەمێ حورمەتەوە قەبووڵی ئەو چارەنووسەی بکات. لەگەڵ ئەم خایلە نوێ و ئارامبەخشەدا یەکەمین وەنەوزەکانی لەهۆشخۆچوون بردییەوە. بە خەیاڵیدا هات شتێکی باشە کە مرۆڤ بەدەم خەولێکەوتنەوە بمرێت. ئەوە عەینەن کاریگەریی ماددەی بێهۆشخەر وایە. ڕەقبوونەوە، وەك خەڵکی باسی دەکەن، ئێجگار ئەوەندە ناخۆش نییە. مردن گەلێك جۆری خەراپتری هەیە.

هاتە بەرچاوی کە کوڕەکان سبەینێ لاشەی بەشەختەبووی دەدۆزنەوە. خۆی بینی لەگەڵ ئەواندا بە ڕێگاکەدا دێت و لە خۆی دەگەڕێت. لەگەڵ ئەواندا بە ڕێیەکەدا پێچ دەکاتەوە و خۆی کەوتووی لە بەفرەکەدا دەدۆزێتەوە. پیاوەکە چیدی خاوەنی خۆی نەبوو، لە خۆی هاتبووەوە دەرەوە، لەگەڵ کوڕەکاندا وەستابوو و تەماشای خۆی لە بەفرەکەدا دەکرد. بیری لەوە دەکردەوە کە هەر بە ڕاستی ساردە. کە گەڕایەوە بۆ ئەمەریکا دەیتوانی بۆ کەسوکاری بگێڕێتەوە سەرمای ڕاستەقینە چۆنە. لێرەوە خەیاڵی چووەوە سەر پیرەکەی چەمی گۆگرد. تەواو بە ڕوونی هاتە پێشچاوی کە پیرە گەرموگوڕ جێی خۆی خۆش دەکا و پایپ دەکێشێت.

لە ژێر لێوەوە بە پیرەکەی چەمی گۆگردی گوت:" تۆ ڕاستت کرد، هەی پیرەی



قۆشمە، تۆ ڕاستت دەکرد."

پاشان پیاوەکە ڕۆچووە خۆشترین و ئاسوودەترین خەوێکەوە کە تا ئەو کاتە بینیبووی. سەگەکە بەرانبەری هەڵتروشکا و چاوەڕێی دەکرد. ڕۆژەکە بە درێژبوونەوەی کاوەخۆی ئاسۆ کۆتایی هات. لەوە نەدەچوو چ ئاگرێك بکرێتەوە و جگە لەوەش سەگەکە هەرگیز لە ژیانیدا چ کەسێکی نەناسیبوو کە لە سەرمایەکی ئاوهادا بەبێ ئاگر دانیشێت. لەگەڵ تاریکبوونی ئاسۆدا سەگەکە زیاتر و زیاتر هەستی بە پێداویستیی ئاگر دەکرد. لاقەکانی بە ئاماژەی ڕۆیشتن دەهێنان و دەبردن و قروسکەقروسکێکی دەکرد و چاوەڕوان بوو پیاوەکە فەرمانی نەجوڵانی پێبدات. بەڵام کابرا متەقی لێوە نەدەهات. سەگەکە بەرزتر دەیقروسکاند و لە پیاوەکە نزیك دەبووەوە و بۆنی مردنی دەکرد. ئەمەش وای لە ئاژەڵەکە کرد پاشەوپاش بپرینگێتەوە. تاوێکی تریش خۆی خلافاند و لەژێر درەوشەی ئەستێرەکانی ئەو ئاسمانە ساردەدا دەیقروسکاند. پاشان بەرەو کامپ ڕووی وەرگێڕا و بەرەو لای خەڵکانیك ملی ڕێی گرتە بەر، کە ئاگر و خواردنیان لە لا دەست دەکەوت.

پەراوێز:

١ **cheechako:** بەو کەسانە دەوترێ، کا تازەکی چوون بۆ ئەلاسکا و شارەزای کەشوهەوا و ئاژەڵ و کولتووری ناوچەکە نین و نازانن لە کاتی سەفەر بەو ناوچانەدا چ پێداویستییەك هەڵگرن.

٢ ئەربە: ئامرازێکی گواستنەوەیە لە بەفردا بەکار دێت؛ لە سەگ دەبەسترێت و ڕادەکێشرێت.

٣ مێرکیوری: لە ئەفسانەی گریکیدا خوداوەندی پۆستە؛ خاوەنی جووتێك باڵە و نزیك لە ڕووی زەوییەوە دەفڕێت.

سەرچاوە:

**Best Short Stories of All Time, Volume I _ Edited by J. D. Labranche**

# تاك و سوژە و ئەكتەر لە تێڕوانینی ئالان تورێنەوە

## ئامادەكردنی ئەحمەدی مەلا

كولتووری فیكریی ئێمە هێشتا دەستەواژە و زاراوەكانی بە تەواوی دانەڕشتووە، ئەمەش گرفت بۆ وەرگێڕان و گرفت بۆ ئاڵوێركردن دروست دەكات. ئەگەر "ئەندیڤیدیو" بكەینە تاك، ئەوە بەرامبەر بە "سوژە" شتێكی دیكەمان نامێنێ. بۆیە وەكو خۆی بەجێی دەهێڵین. دەبێ "ئەكتەر"یش لە مانا باوەكەی داماڵین و لە بواری كۆمەڵایەتیدا پێناسەی بكەینەوە. بە گوێرەی تورێن، ئەم سێ تێرمە؛ تاك و سوژە و ئەكتەر، پێناسەكردنیان لە پەیوەستیی یەك بە ئەوی دیكەوە ئەنجام دەدرێت. وەكو چۆن فروێد كاتێك باسی سەرهەڵدانی "من" دەكات، وەكو بەرهەمێكی ئەنجامدراو، ئەویش لە ڕێگەی

کاریگەریی "منی باڵا" بەسەر "ئەو"دا دروست دەبێ و لە هەمان کاتیشدا "ئەو" بە بەشێکی "من"یش دەناسرێتەوە. مرۆڤی پێشمۆدێرنە عەودالی حیکمەت بوو و هەستی دەکرد لە لایەن هێزێکی ناشەخسانی و پیرۆزەوە دیاری کراوە، تەنانەت خۆشەویستیش بەشێك بووە لەم هێزە. تورێن خۆشەویستی وەکو هێزێك بەکار دەهێنێ، بەڵام دەبێ لە سیاقی ئایینی مەسیحییەتدا ئەم خوێندنەوەیە لێك بدرێتەوە، چونکە "خۆشەویستی" کۆڵەکەی مەسیحییەتە، کەچی لە ئایینی ئیسلامدا دەکرێ ئەم پێکهاتەیە لەگەڵ دەستەواژە بەرامبەرەکەی بخوێندرێتەوە. وەك چۆن سزا بەرامبەر بە پاداشت و میهرەبانی بەرامبەر بە توورەیی دەوەستێت. لەم دیدەوە، کاتێك ئێمە فیکری ڕۆژئاوا وەردەگێڕینە سەر زمانە ڕۆژهەڵاتییە ئیسلامییەکان، ئەم فیکرەیە بە تەواوی هەموو کەلێنەکان پڕ ناکاتەوە، چونکە سیاقە مێژووییەکان، پاشخانی فیکریی و مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەمان ڕێڕەویان وەرنەگرتووە.



تورێن کتێبەکەی لەمەڕ "ڕەخنە لە مۆدێرنە"یە، کەچی کۆمەڵگەی ئێمە دەکەوێتە پێش مۆدێرنەوە. بۆیە دەبێ زۆر بە وریاییەوە چەمك و دەستەواژەکان پێشنیاز بکەین. بۆیە خوێنەری بەتوانا دەتوانێ لە ئاقارەکانی پاشمۆدێرنە بگات، بەڵام ژینگەی سروشتی ئەو نییە. ئێمە لە مۆدێرنە ناژێین تا بتوانین ڕەخنەی لێبگرین، ئەگەر ڕەخنەشی لێبگرین، تەنها ڕووە تیۆرییەکەی دەگرێتەوە.

مۆدێرنیتێی سەرفراز و سەرکەوتوو دەیەوێ جێگەی ئینسان لە نێو ئەنتێگراسیۆنی کۆمەڵایەتیدا بکاتەوە. واتە لەژێر بارستایی حیکمەت و پیرۆز و چەمکە ئایینییەکان قوتاری بکات و ڕۆڵێکی نوێی پێببەخشێ، ئەویش ڕۆڵی کۆمەڵایەتییە. ئەم ڕۆڵە، دەکرێ کرێکار بیبینێت، دەکرێ سەرباز بیبینێت، یا هەر هاووڵاتییەکی دیکە کە بەشدارە لە بەرهەمی دەستەجەمعیدا؛ لەجیاتیی ئەوەی ئەکتەری ژیانی شەخسیی خۆی بێت، دەبێتە ئەکتەرێکی کاری هاوبەش و پێکەوەیی. مۆدێرنیتێ سەردەکەوێت کاتێك، لەجیاتیی ئەوەی ئینسان لە سروشتدا بێت، سروشت لە ئەودا دەدۆزێتەوە. سوژە نایەتە بەرهەم تەنها ئەو کاتەی کە ژیان لە ناو تاکدا بەرگری لە خۆی دەکات، لەجیاتیی ئەوەی وەکو ئیبلیسێك بخوێندرێتەوە و پێویست بکات لە ڕەگەوە هەڵکێشرێت، وەکو لیبیدۆ و سێکسوالیتێ دەردەکەوێ و دەبێ بە یەکێتییەکی کەس. تاك یەکەیەکی تایبەتە، کە ژیان و بیر، ئەزموون و هۆشیاریی تێدا کۆ دەبێتەوە. دەکرێ

بوترێ کە سوژە تێپەڕگەیەکە بۆ ئەوەی "ئەو" ببێتە "من"، مەبەست لە "من"ی قسەکەر، یا "من"ی بکەرە. لەم ئاستەوە تاك دەگۆڕدرێتە ئەکتەر، دەبێتە ئەکتەر و دەچێتە بواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە و کاریگەریی بەسەریانەوە دەبێ، بەڵام بەبێ ئەوەی لە ناو گروپێکدا بتوێتەوە، یا لە نێو کۆگەراییەکی دیاریکراودا ون ببێ. لێرەوە ئەکتەری کۆمەڵایەتی نە کەسێکی حیزبییە، نە لە نێو کوتلەیەکی دیکەدا شوناسی خۆی ون کردووە. چونکە ئەکتەر ئەو کەسە نییە، کە بە گوێرەی ڕاچێتە هەڵسوکەوتەکانی دیاری دەکات، بەو کارە هەڵناسێت کە لە نێو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکاندا پێی ڕاسپێردراوبێ، بەڵکو ئەو کەسەیە کە دەسکاریی دەوروبەری ماددیی خۆی دەکات و دەیگۆڕێ، بە تایبەت لە بواری کۆمەڵایەتیدا. ڕێڕەو و بڕیارەکان دەگۆڕێت و پەیوەندییە باڵادەستەکان وەردەچەرخێنێ و دەسکاریی ئاڕاستە کولتوورییەکانیش دەکات. کاتێك لە دیدگای پارتە چەپڕەو و ڕاستڕەوەکان سەیری دەرەوە دەکرێت، ئەوان تەنها باسی مەنتیقی بارودۆخ و بەرهەمهێنانی کۆمەڵگە دەکەن. بەڵام کۆمەڵگە لە گۆڕانکاریی بەردەوامدایە و تا دێتیش، ئەم گۆڕانکارییە خێراتر دەردەکەوێت، بۆیە ئەگەر ناولێنانی بە بارودۆخ دەستەواژەیەکی سیاسی بێت زیاتر وەکو گوزارشتکردنێکی مەنتیقی ناشەخسییانەی ئابووری و تەکنیکی.

خوێنەر خێرا تێدەگات، تورێن باس لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا دەکات، بە تایبەت کۆمەڵگەی فەڕەنسی. چەمکی پارتی ڕاستڕەو و چەپڕەو لە وڵاتێکی وەکو فەڕەنسا جیاوازە لە ڕاستڕەوی ئیسپانیا و چەپڕەوی ئیسپانیا، ئەم شیکردنەوە و ڕاڤەکردنە کەمتر وڵاتێکی وەکو کوردستان دەگرێتەوە. لە فیکری سیاسیی فەڕەنسییەکاندا، چەپڕەو مێژوویەکی دیاریکراو و ڕاستڕەویش مێژوویەکی دیکەی هەیە. ئەم دوو خێزانە سیاسییە ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی سیاسیی ئەو وڵاتەن.

ئەو فیکرەیەی کە جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە ژێرخانی ماددی دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی سەرخانی سیاسی و ئایدیۆلۆژی، کە بۆچوونێکی تەواو قبوڵکراوە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا کاتێك ئاماژە بۆ سەرکەوتنی سەرمایەداریی لیبرال دەکات کە کارل مارکس و فێرناند برۆدێل جەختیان لەسەری کردووە، بەڵام ئەم بۆچوونە سەدەی بیستەم ناگرێتەوە، کە تیایدا شۆڕشی سیاسیی باڵادەست، سەرهەڵدانی سیستەمی شموولی، دەوڵەتی پرۆڤیدانس (مەبەست لەو دەوڵەتانەیە کە ئامادەگییەکی زۆریان لە ڕێکخستن و تەنزیمکردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا هەیە)، هەروەها گەشەسەندنێکی



بەرچاوی فەزای گشتی دەبینرێت.

کەواتە، بەگوێرەی تورێن، شتێکی سروشتییە کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان وردەوردە زمان و دەستەواژە کۆنەکانیان فڕێ بدەن و زیاتر باس لە ئەکتەری کۆمەڵایەتی بکەن. لە ئەدەبیاتی مارکسدا باسی لە زۆرانبازیی چینایەتی دەکرێت و تاك خۆی وەك ئەندامی چینێکی دیاریکراوی کۆمەڵگە دەناسێنێت. ئەم بەکارهێنانە لە لای تورێن شتێکی نامۆ نەبووە. تەنانەت خودی خۆی لەجیاتیی چینی کۆمەڵایەتی و بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی بەرکاری هێناوە. ئەم فیکرەیە، واتە فیکرەی "ئەکتەری کۆمەڵایەتی" لە سوژە دابڕاو نییە، چونکە ئەگەر ئەکتەر خۆی وەك سوودمەند لە ناو جەستەیەکی کۆمەڵایەتی پێناسە نەکات، لێرە ئاماژەیەکە بۆ چینی کۆمەڵایەتی، یا گوێڕایەڵی فرمانە باڵاکانی خوداوەند نەبێ، لێرە ئاماژەیەکە بۆ تاکی ئایینی، کەواتە دەبێ پرەسنیپێك ببێتە هاندەری، جگە لەوە کە نەبێتە سوژە، واتە فراوانکردنی ئازادییەکانی و پاراستنی ئەو ئازادییانە زیاتر؟



سوژە لای ئالان تۆرێن، لەم ڕووەوە لە ئەکتەری کۆمەڵایەتی دانەبڕاوە. ڕەنگە ئەگەر چەمکی هۆشیاریی" بترنجێنینە نێو سوژەوە، مەبەست لەو تاکەیە کە هۆشیارە بەرامبەر بە ئازادییەکانی و لە هەمان کاتیشدا هەوڵ دەدات سنوورەکانی ئەو ئازادییە بەرینتر بکات و بیپارێزێت، ئەو کات وێنەکەمان لا ڕوونتر دەبێ.

ئەگەر ئاوڕێك لە کۆمەڵگەی کوردی بدەینەوە، دەبینین ئێمە لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی "تاك"داین، کە هێشتا لە ڕووی یاساییەوە، لە ڕووی هۆشیارییەوە کامڵ نەبووە و دەرنەکەوتووە. تاکی کورد بە قۆناغی وەرچەرخان تێدەپەڕێ، لەسەر پردی پەڕینەوە لە هاوبەستی بە خێڵ و هۆزەوە، لە هاوبەستی بە ئایینەوە، لە هاوبەستی بە حیزبەوە، سەرباری بەهەندوەرگرتنی ئەم چەمکانە، لە شوناسی خۆشی دەگەڕێ، بەڵام هێشتا بە تەواوی ئاقار و سنوورەکانی بە تەواوی دەرنەکەوتوون. تاك هێشتا نامۆیە بە خودی خۆی. ئەم نامۆبوونە بەشێکی ئەدەبیاتی کوردیشی گرتووەتەوە. پرسیاری ئێمە ئەوە دەبێت: ئایا سەرهەڵدانی سوژە دەشێ لە کۆمەڵگەیەك کە هێشتا پرۆسەکانی بە تاکبوون بە تەواوی گەشەی نەکردبێ، بوونی دەبێ؟ ئایا تاکی ئێمە وابەستەی کۆمەڵایەتیی نییە؟ ئایا تاکی ئێمە هێشتا تاکێکی ئایینیی نییە، کە ڕەهەندەکانی قەدەر و ناعەقڵانی و وروژانی کتوپڕ دونیای

ناوەوەی داگیر کردبێ؟

بە بۆچوونی تورێن، سوژە و ئەکتەر دوو چەمکی وابەستەی یەکن و پێکەوە بەرگری لە خۆیان دەکەن بەرامبەر "تاکگەراییەك"، کە ئیندیڤیدیوالیسمێکە، کە زیاتر لۆژیك و مەنتیق دەبەخشێتە سیستەم و ئەم لۆژیکە لە ئەکتەری کۆمەڵایەتی دەسەنێتەوە و بەوە وەسفی دەکات، کە بە شێوەیەکی ڕاسیۆنال، واتە عەقڵانی بە دوای بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا دەگەڕێ. لە نێو کۆمەڵگەی مۆدێرندا، بەرهەمهێنانی ئەکتەر لە ناو هەناوی سوژەوە ڕەنگە تووشی شکست بێت. دەکرێ تاك و سوژە و ئەکتەر یەك لەوی دیکە جودا ببنەوە. شارستانییەتی هاوچەرخ بە دەستی ئەم نەخۆشییەوە دەناڵێنێ. لە لایەك، ئێمە بە دەستی تاکگەراییەکی نەرجسییەوە دەناڵێنین، لە لایەکی دیکەشەوە نوستالژیبوون، یا نوستالژیی سوژەمان هەیە، لێرە سوژە بە مانا کۆنەکەی بەکار هێنراوە؛ مەبەست لە "ڕەعییەیە": سوژەی دێرین، لە کۆمەڵگە ئایینییەکاندا، هەندێ جار واتایەکی ئێستێتیکی پێدەدەین و هەندێ جاری واتایەکی ئایینی، لە ڕوویەکی دیکەشەوە، ئێمە هەڵدەستین بە کاری خۆمان، لە ناو کۆمەڵگە ڕۆڵێکی دیاریکراومان هەیە، بەشێکین لە کۆمەڵگەی بخۆر، دەنگ دەدەین، سەفەر دەکەین هتد. لە هەمان کاتیشدا چەند ژیانێك دەژین، هەستێکی قووڵمان هەیە لەوەی کە "خود - ذات" جیاوازە لەو شوناسەی کە بە خۆمانی دەدەین، تەنانەت لێشی هەڵدێین، جا چ لە ڕێگەی ماددە هۆشبەرەکانەوە بووبێت، یا هەر بە کورتی لەگەڵ بەرهەڵستەکانی ژیانی ڕۆژانەدا دەژین.

سوژە بەشێکی گەردوون نییە لە ناوماندا، کە ناوی لێبنرێت یاسا سروشتییەکان، واتای مێژوو یا ئافرێنەرێکی خوداوەند بێ. بەڵکو بانگەشەیەکە، کە "خود" بگوازێتەوە بۆ ئاستی ئەکتەربوون. سوژە دەبێتە "من"ی بکەر، هەوڵێکە بۆ ئەوەی ئینسان لە توانایدا هەبێ بڵێ "من"، بەبێ ئەوەی ئەوەش فەرامۆش بکات، کە ژیانی شەخسی لە لایەك پڕە لە "ئەو"، لیبیدۆ، لە لایەکی دیش، ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان تیایدا نیشتەجێیە.




پەراوێزێك:

ئالان تورێن پشت بە چەمکەکانی فرۆید دەبەستێت. بە کورتی، ئەو دەستەواژانەی فرۆید یەکالا دەکەینەوە؛ ئەو شۆڕشەی کە فرۆید بەرپای دەکات، دەکرێ ئاسان

بکرێتەوە. بیردۆزەی دەروونناسی یەکێتیی ئینسان تێك دەشکێنێت، کە لەوەوپێش دێکارت و کانت باسیان لێوە کردبوو و ئەوەی دەستینشان کردبوو، کە سوژە لە ڕێگەی هۆشیارییەوە توانای وێناکردنی هەیە. ئەم هۆشیارییە لە فەلسەفەی کلاسیکدا لە یەکەیەك پێك هاتووە، لە بلۆکێکی یەکگرتوو پێك هاتووە و هیچ درزێکی تێدا نییە.

فرۆید، سەبارەت بە هۆشیاری، تیۆرییەکی دیکەمان پێشکەش دەکات. دۆخی یەکەمی ئەم تیۆرییە لە (هۆشیاری و پێشهۆشیاریی و ناهۆشیاریی) پێك هاتووە، بەڵام فرۆید خێرا لە سنوورەکانی ئەم ڕیزبەندییە تێگەیشت؛ بۆیە لە ساڵی ١٩٢٣ دۆخی دووەم پێشنیاز دەکات، کە لەسەر سێکوچکەی (ئەو، من، منی باڵا) پێك هاتووە. ئەم سێ ئاستە ڕەفتاری مرۆڤ دەستنیشان دەکەن، چ ئەوانەی پەیوەندییان بە هۆشیارییەوە بێت، چ ئەوانەی کە پەیوەندییان بە ناهۆشیارییەوە هەبێت. "ئەو" و "من" و "منی باڵا" بەم جۆرەی لێدێت:



ئەو: ئاماژە بۆ لایەنە تاریکەکانی ئینسان دەکات، لایەنە غەریزەییەکانێتی، ئەو هەوارە دووردەستانەیە، کە پەیپێبردنیان زۆر سەختە. هەواری پاشاگەردانی، جێگەی ورووژانە هەرە سەرەتاییەکانە. لە ڕێگەی پاڵنانەوە کە بە زمانی سایکۆلۆژی پێی دەوترێت "پولسیۆن"، کە لە پێکهاتەیەکی بیۆلۆژی و دەروونی پێك هاتووە، پەیوەستە بە ناهۆشیارییەوە، لە نێو ئۆرگانیسمدا بارێکی بگرەوبەردەیی دروست دەبێت بۆ ئەوەی ژیانی فەنتاسماتێك، ئارەزووە داپڵۆسراو و خەونینەکان بهێنێتە دی و هەوڵ دەدات ئەو ئارەزووانە هێور و کپ بکاتەوە.

پڕە لە وزەیە، بەڵام هیچ جۆرە ڕێکخستنێکی تێدا نییە، ئیرادە لەو شوێنە جێگەی نابێتەوە، تەنها بە تەنگی ئەو شاڵاوانەوە دەچێت، کە لە ڕێگەی حەز و لەززەتەکانەوە دروست دەبن. هاودەمیی خۆی لەگەڵ پرەنسیبی ئارەزوو یەك دەخات. "ئەو" دڵی بە هیچ بەربەستێك ناکرێتەوە و وەکو ئەوە وایە، کە کات سەری لێنەدات. بەو ئاژەڵە وەحشەتناکە دەکات، کە هەندێ جار دەیەوێ تەڕ و وشك پێکەوە بسووتێنێ.

من: ئەو بەشەیە کە شەخسییەتی یەکێك دیاری دەکات، کە هۆشیارییەکان بەڕێوە دەبات. پەیامی "من" وێناکردنی جیهانە بەرامبەر بە "ئەو" بۆ ئەوەی بە سوودی "من" کۆتایی بێت. بۆیە، "من" بەبێ "ئەو"، کە بەبێ جڵەو بەرەو تێرکردنی غەریزەکان هێرش دەبات، بەرامبەر بە هێزی دەرەکی، کە لەو بەهێزتر و بە تواناترە، ڕێبەستی بۆ دەکات و

دەیڕوخێنن. "من" پرەنسیپەکانی لەززەت هێور دەکاتەوە، کە لە ناو "ئەو"دا بە شێوەیەکی ڕەها و عەجول سەروەریی خۆی نیشان دەدا. پرەنسیپی لەززەت دەگۆڕێ بە پرەنسیپی واقیع، کە لە هەمان کاتدا ئاسایش و سەرکەوتنی بۆ دابین دەکات. "من" سەقامگیریی سوژە پێك دەهێنێت و بەردەوام خەریکی جڵەوگرتنەوەی لەززەتاکانە.

منی باڵا: وێناکردنی چەپبووی سەرجەم ئەو شتانەی کە لە لایەن دایکوباوکەوە قەدەغە کراون، وێناکردنی ئەو توانایەیە، کە "من" دەبێ حیسابی بۆ بکات و گوێی لێبگرێ. مرۆڤ لە قۆناغی منداڵیدا، بێگومان ملکەچی "منی باڵا" دەبێ، دەچێتە ژێر ڕکێفی ئەوەوە. ئەم "منی باڵا"یە هەمیشە وەکو دەنگێکە لە ناوەوەمان بەردەوام پێمان دەڵێ "نابێ ئەمە بکەی"، بە یاسایەکی ئەخلاقی دەکات، کە کاریگەریی بەسەر ئێمەوە هەیە و بەبێ ئەوەی لە بنەچەکەشی تێگەیشتبێتین.

**

سوژە هەرگیز ناتوانێت سەربکەوێت ئەگەر ئەو وەهمەی هەبێ، کە تاك بسڕێتەوە و هەروەها سێکسوالێتی و ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانیشی. لەم بارەدا دەبێتە "منی باڵا"، بە واتایەکی دی، سوژەك فڕێ دراوەتە دەرەوەی تاکەوە. بە بوونی بە یاسا، خودی خۆی دەسڕێتەوە، کاتێك خۆی بە شتێکی دەرەکی دەچوێنێ، مەبەست لە شتێکی هەرە ناشەخسانی، لێرە مەبەست لە هێزە نادیارە خواییەکانە.

سوبژەکتیڤاسیۆن مەبەست لەو پرۆسەیەیە، کە تاك دەبێتە سوژە. سوژەبوون بەو مانایە دێ، کە سوژە دەرژێتە نێو تاکەوە، واتە گۆڕانکاریی تاك بە سوژە. ئەوەی کە پێی دەوترێت نیزامی جیهان، وەردەگێڕدرێتە پرەنسیپی ئاراستەکردنی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکان.

سوبژێکتیڤاسیۆن تەواو پێچەوانەی ملکەچیی تاکە بەرامبەر بە بەها باڵاکان: ئینسان خۆی لە ناو خودادا دەدۆزێتەوە؛ بەڵام لە جیهانی مۆدێرندا ئەو خۆی دەبێتە بناغەی بەهاکان، واتە بەهاکان لە دەرەوەوە ناسەپێندرێن، بەڵکو لە ناوەوەی مرۆڤەکەوە، چونکە پرەنسیپی سەنتراڵ، پرەنسیبی بنەڕەتیی ئەخلاق دەبێ بە ئازادی. ئەم داهێنانە خۆی دەبێ بە ئامانجی خۆی و دژ بە هەموو وابەستییەك دەوەستێت.

لە زمانی کوردیدا یەك "من"مان هەیە، بەڵام لە زمانی فەڕەنسیدا "موا" و "ژ" هەیە، یەکەمیان ئەو "من"ەیە کە لەسەرەوە لەژێر ڕۆشنایی دیدگای فرۆیدەوە



پێناسەمان کرد، ئەوە دووەمیشیان ئێمە "منی بکەر"ی بۆ دادەنێین. مەبەست لێ منێکی چالاك، منێکی قسەکەر یا کارکەرە.

دەتوانین بڵێین، سوبژەکتیڤاسیۆن "من" دەڕوخێنێ، ئەو "من"ەی کە خۆی لە نێوان هەڵسوکەوت و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان پێناسە دەکات و لە هەمان کاتیشدا لە ڕێگەی ئەنتێرئەکسێنەوە، واتە لە ڕێگەی "هاو/کار"ی کۆمەڵایەتی و ئەو کردانەوە کە ڕۆڵی بە کۆمەڵایەتیبین دەبینێ، خۆی ڕێك دەخات و خۆی دروست دەکات. "من" خۆی دەڕوخێنێ: لە لایەك سوژە، لە لایەکی دیکەش "خود". خود سروشت و کۆمەڵگە لە یەکتر مارە دەکات، وەکو چۆن سوژە تاك و ئازادی پێکەوە گرێ دەدا. وەکو چۆن فرۆید ڕوونی دەکاتەوە، ناکرێ سوژە لە دەرەوەی "منی باڵا"دا خۆی بەیان بکات، لە هەمان کاتدا وابەستەی خود بێ، لە لایەکی دیکەش وابەستەی "ئەو"ە. کەچی لە "من" دادەبڕێ، کە شیکردنەوە وەهمەکانی لەناو دەدات. سوژە ئەو ڕۆحە نییە، کە دژ بە جەستە ڕادەوەستێ، بەڵکو واتایەکە کە ڕۆح دەیبەخشێتە جەستە، دژی وێناکردنەکان و نۆرمە سەپێندراوەکانە، کە لە لایەن نیزامی کۆمەڵایەتی و کولتوورییەوە پەیدا بووە. سوژە لەم ڕووەوە، لە هەمان کاتدا ئەپۆلۆنییە و دیۆنیزیاکییە. بە واتایەکی دی، یاسا و خەیاڵە لە هەمان کاتدا.



هیچ شتێك هەندەی هۆشیاریی "من" دژ سوژە نییە، چ خودپشکنین بێ یا شیکلی هەرە بەرزی وەسوەسەی شوناس بێت، مەبەست لە نەرجسییەتە. سوژە هۆشیاریی باش و خراپ لەناو دەدات. نە بانگەشە بۆ هەست بە گوناهکردن دەکات، نە بۆ ئۆخژنی خود: هانی تاك دەدات، یا هانی گروپێك دەدا لەپێناو بەدەستهێنانی ئازادی، ئەویش لە ڕێگەی خەباتی بێوچان لە لایەك دژ بە نیزامی باو و سەپاو لە کاردایە، لە لایەکی دیکەش دژ بە سنووردارییە کۆمەڵایەتییەکان دەوەستێت. چونکە تاك ئەو دەمە دەبێتە سوژە، کاتێك دەبێتە خاوەنی بەرهەم و کارەکانی خۆی. لە هەمان کاتیشدا، ئەم بەرهەم و کارانە بە ئاسانی خۆیان نادەن بە دەستەوە، وەدەستهێنانیان ئاسان نییە. ئەم خۆبەدەستەوەنەدانە پۆزەتیف دەکەوێتەوە چونکە ڕاسیۆنالیزاسیۆنە، واتە عەقڵاندنە، چونکە عەقڵ خۆشی کەرەسەیەکە بۆ ئازادی؛ نێگێتیڤیشە، چونکە خودی عەقڵاندن لەژێر ڕکێفە و کۆنترۆڵ کراوە و لە لایەن خاوەنکار و مۆدێرنخوازان و تەکنۆکرات و بیرۆکراکانەوە بەکار دێت، ئەویش لە پێناو ئەوەی

دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر ئەوانەی کە دەیانەوێ بیانکەن بە کەرەسەی بەرهەمهێنان و بەرخۆری.
بێوچان، "منی بکەر" و "خود"، نەك تەنها لە لایەن نۆرم و پێناسەی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەڵکو لە لایەن هۆشیاریی خودیشەوە کە هەوڵی ئەوەی داوە "منی بکەر" بە "خود" گرێ بدات لەپێناو ئەوەی کە "منی بکەر" جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە بۆ باوەشی خوداوەندەکان و کەوتنەخوارەوەی "خود" بۆ باوەشی "ئەو". لە سەدەی شانزەمەوە، ئیومانیسم لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە خوداوەندەکان و سروشت لە یەك ئاشت بکاتەوە، ئیمان و کڵێسا پێکەوە گرێ بداتەوە، هەروەها سوژە و هۆشیارییش بەیەك ئاشت بکاتەوە. مۆنتێن لەو ڕووەوە هەرە بەرزترین ڕەوانبێژیی بەکار هێنا و ڕوونترین گوزارشت لێکردووی ئەو دۆخە بوو. بەڵام ئەم وانەیە لەمەڕ وریایی و حیکمەتەوە نەیتوانی دژ بەو دابڕانە زەروورییە ڕاوەستێ، نە دژ بە گەڕانەوەی خودە وەکو سوژەك کە تاکی مۆدێرن خۆی پیادە کردووە و بێوچانیش هەوڵی تێکدانی نیزامی باو و سەپێنراو دەدات. ئەو کاتەی کە سوژە خۆی بە پشکنینی خۆیەوە خەریك دەکات و ڕۆڵی کۆمەڵایەتیی خۆی بەسەر خودیشدا دەسەپێنێت، هەموو هێز و وزەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و شەخسیمان سەبارەت بە داهینان ون دەکات و هەر وەکو مۆزەخانەیەکی پۆستمۆدێرنی لێدێت، کە لە ڕێگەی یادەوەرییەکانەوە جێگۆڕکێ بە بێتواناییمان دەکەن سەبارەت بە هێنانەدیی بەرهەمێکی دیاریکراو.
میشێل فوکۆم بەسەر کردەوە، فوکۆ لە پرۆسەی سوبژێکتیڤاسیۆن ملکەچیی بەدی دەکات. وەکو دەیانوت، دەبێ ئینسانی ناوەکی دروست بکرێت، مەبەست لە ئینسانی "سایکۆلۆژی"یە، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی گەشە بکات، بۆ ئەوەی نەك تەنها بە نێو دەمارەکاندا، بەڵکو بە ناو دڵ و هۆش و سێکسیشدا بڵاو ببێتەوە. بەڵام ئەم "شزوز"ی سوبژێکتیڤاسیۆنە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ جێگەی لە دایکبوونی سوژە بگرێتەوە یا جێگەی واتای سەرەکیی سوژە بگرێتەوە. سەرەتا، لەو شوێنەی ڕژێمی شموولی بەرقەرارە، هێزی سەرەکیی بەرگریکردن کە دژی ئەو ڕژێمە شموولییە خۆی ڕێك دەخات، ئەمە جۆرە بانگەشەیەکە بۆ سوژە. گرینگ نییە ئەگەر شیکل و شێوەیەکی ئایینی وەربگرێ یا نا، یەکێکی وەکو سۆلجێنستین بێ یا ساکارۆڤ بگرێتەوە. پێش سەدەیەك، ڤێبەر، بانگەشەی بۆ ئێتیکێکی لێپرسراوانە دەکرد وەك لە ئێتیکێك کە لەسەر بنەمای باوەڕ بنیات نرابێ. سۆسیالیستی قۆناغی یەکەمی پیشەسازی بڕوای وابوو، کە بزوتنەوەی کرێکاران دەبێتە هۆکاری سەرخستنی مۆدێرنێتە بۆ وەدەستهێنانی



سۆسیالیستی. بۆ ئەوەی دژ بە هەموو جۆرە داپڵۆسانێك بین، دەبێ تێکڕای سوژە بخرێتە گەڕ، میراتی ئایینی بێ، یادەوەریی منداڵی بێ، دید و بیر بێ، ئازایەتی بێ. ماکس هۆرکهایمەر فیکرەیەکی جوانی سەبارەت بەم سەدەیەی ئێمە فۆرمولە کردووە و نووسیویێتی: "تەنها عەقڵ بەس نییە بۆ ئەوەی بەرگریی لە عەقڵی پێبکرێ" ئاماژە بۆ بێتوانایی ئەنتێلکتوال و خەباتگێرە ئەڵمانییەکان دەکات بەرامبەر بە " هەڵکشانی بێوچانی ئاتورو ئوی"، ئاماژەیە بۆ شانۆنامەیەکی بێرتۆلد برێشت. ئەم ڕستەیە کە کاردینال لوستیژێ لە یاداشتەکانی خۆیدا بەکاری هێناوە، خۆی لە عەقڵانییەتێکی زۆر لەخۆبایی دەپارێزێت، کە هەڵگری ئایدیۆلۆژییەتی چاخی ڕۆشنگەریی بوو. ئەم بانگەشەیە بۆ سوژە، وەکو ململانێی نێوان سوونەتی و مۆدێرن، وەك چەمکێکی سەنترال ڕەت دەکاتەوە. یەکێکی وەکو نیتشە و فرۆید یەکەمین کەس بوون، کە گرینگیی ئەوەیان دەسنیشان کرد کە ناوەوەی ئینسان شوێنێکیشە بۆ لایەنی ئەفسانە و بیروباوەڕە دێرینەکان. واتە دژایەتی عەقڵانی و ناعەقڵانی مەبەست نییە. هەمووومان ئەو کارەساتانەمان بینی، ئەو کارەساتانەی کە بەرهەمی خودی مۆدێرنیتێ بوون، لە لایەن دەوڵەتە شموولییەکانەوە بەرهەم هێنران. ئەوەش دەزانین کە بەرهەمهێنانی سوژە، بیچمی سەنترالی مۆدێرنیتێ مومکین نییە سەرهەڵبدا بەبێ ئەوەی هۆشیاریی جەستەی تاك لە ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان جودا نەکاتەوە. نە بیچمە دێرینەکانی سوژە، لە شیکلی خودا فڕێ دراوەتە گەردوون، ئەو ئیرادەیەی کە دەیەوێ خود وەکو کەس دروست بکات.



فیکرەی سوژە وەك پرەنسیپێکی ئەخلاقی دژ بە فیکرەی کۆنترۆڵکردنی ئارەزووەکان دەوەستێت، ئەویش لە ڕێگەی عەقڵەوە. ئەم چەمکە لە زەمانی ئەفلاتوونەوە ئامادەگیی هەیە تا دەگاتە ئیدیۆلۆگەکان "ڕاسیۆنال چۆیس"، هەروەها دژ بە چەمکی "باشە" لە جێبەجێکردنی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکاندا. تەنانەت دەکرێ ئەم سێ دیدە دژبەیەکە وەکو سێ قۆناغی یەك لە دوای یەك لە مێژووی فیکرە لە بارەی ئەخلاقەوە پێناسە بکەین. سەرەتا فیکرەی ئەوە خۆی بەیان دەکات لە جیهان خاوەن نیزامێکە، سەرباری بۆچوونە جیاوازەکان ئەو نیزامە بە عەقڵانی وەسف دەکرێت. ڕەفتاری هەرە باڵا ئەوەیە کە تاك لەگەڵ نیزامی جیهاندا هەمەئاهەنگ دەکات. سێکولاریزاسیۆن ئەم بۆچوونەی لاواز کرد، چونکە عەقڵانییەتی بابەتییانەی بەوە پێناسە کرد، کە لە عەقڵێکی سوبژەکتیف زیاتر هیچی دیکە نییە. سوودگەرایی

کۆمەڵایەتی لەو بۆچوونەوە بەهاکانی دەسگیر دەکات، بە بەشداربوونی هەر تاکێك لەم کارە هاوبەشە. بەڵام کاتێك ئەم ئەخلاقە کۆمەڵایەتییە لە لایەن بیرمەندانی ڕەخنەئامێزەوە کەوتە بەر لێکۆڵینەوە، نموونەی نیتشە و مارکس و جەختکردن کە تاك وەکو سوژەیەك دەتوانێ شوێنێکی سەنتراڵ لە کۆمەڵگە دیاریی بکات، بەڵام ئەم جەختکردنە زیاتر وەکو تاکگەراییەك دەخوێندرێتەوە. بەپێی پرەنسیپی ئەم ئەخلاقە ناکرێ لە دەرەوەی مافەکانی تاکدا بخوێندرێتەوە. واتە نابێ لە دەرەوەی ئازادیی ژیانی ئازادانە و پەیڕەوکردنی ئارەزووەکاندا. ئەمە دیدگایەکی سروشتگەراییە کە هەموو نۆرمێك دەسڕێتەوە، واتە هەموو سزایەکیش لەگەڵ خۆی ڕاپێچ دەکات. بۆ نموونە، بەرامبەر بە پیاوکوژان و لاقەکەران ئەم نۆرم و سزایانە نەمێنن، ئەوکات هەست دەکرێت چ بەرچەکردارێکی توندی لێدەکەوێتەوە، ئەوەش نیشان دەدەن، کە چەند ئاستەنگە بە سروشتی نێوزەد بکرێ و چەندیش وەکو بۆچوونێکی سادە دەردەکەوێت.

بەڵام ئەم جیهانبینییەی پێشکەوتنگەرایی (ئەم ڕێبازە لە دوا نیوەی سەدەی نۆزدەهەم سەرهەڵدەدا لە ژێر ناونیشانی "ئێڤۆلیوسیۆنیست" واتە هەموو کۆمەڵگەیەك لەسەر هەمان ڕێباز ڕەوت دەکات. لە کۆمەڵگەی سەرەتاییەوە دەست پێدەکات و بە کۆمەڵگەی شارستانییەت کۆتایی دێت) کورتبڕ و تەنانەت جێی مەترسیشە. چونکە ئەوە فەرامۆش دەکات، کە ئەوەی پەیوەندیی بە بۆچوونێکی مۆدێرنەوە هەبێ سەبارەت بە سوژە، لەژێر پەردەی سێیۆکلاریزەکردن، فیکرەیەکی دێرینە، سەرچاوەی مافی سروشتیی ئینسانە، بەپێی ئەمە، هەموو ئینسانەکان یەکسانن و خاوەن هەمان مافن، چونکە مەخلوقاتی خودان. بە پێچەوانەشەوە، فیکرەی هاوئاهەنگی لەگەڵ نیزامی جیهاندا، ئەویش شیکل و شێوەی مۆدێرن وەردەگرێ، بەڵام هەمیشە و بێوچان وەك هەرەمییەتی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێ ؛ ناوەڕۆکەکەی گۆڕانکاریی بەسەردا دێ، تەنها کاتێك لە سەرووی هەرەمدا پیاوانی ئایینی و جەنگاوەران و زانایان و بزنسمانەکان دابنرێن. کەواتە دەبێ بێوچان دژ بە ئەخلاقییەتی نیزام بوەستین، هاوشان لەگەڵ جیهانبینییەکی هەرەمییانە کۆمەڵگە وەك چۆن دژ بە نیزامی گەردوون دەوەستین و ئەخلاقییەتی مافەکانی مرۆڤ کە بانگەشە بۆ میهرەبانیی خوداوەند دەکات، وەکو چۆن بانگەشە بۆ ئینسان دەکات.

شتی جەوهەریی ئەوەیە کە ئەم دوو بۆچوونە دژ بەیەك دابنرێن. شارل تایلەر ئەخلاقی مۆدێرن بەم شێوەیە پێناسە دەکات: لە هەمان کاتدا ڕێزگرتنە لە



مافەکانی مرۆڤ، ڕێزگرتنە لە ژیانێکی کۆمپلێت و سەربەخۆ، هەروەها پاراستنی کەرامەتی هەر تاکێکە لە ژیانی گشتیدا. ئەم سێ پرەنسیپە زۆر ناتەبا خۆیان لە پێشچاوم نیشان دەدەن و هیچ تەباییەکیش لە نێوانیاندا نییە، چونکە ئەگەر یەکەمیان بەرەو فیکری سوژە داوەتمان بکات، سێیەمیان ئاماژەیەکە بۆ ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، کەچی دووەمیشیان بەرە تاکگەراییەکی زۆر لاپەڕ بانگەشەمان دەکات، یا بەرەو ژیانێکی ژیرانە و کۆنترۆڵکردنێکی پێویستی ئارەزووەکان. ئەم ناتەباییە هەندەی دیکە زەق خۆی نیشان دەدا، کە شارل تایلەر بە وردی ئاماژەی بۆ دەکات: ئەخلاق خۆی بەوە پێناسە ناکات، کە مۆدێرنەکان مەبەست لە ژیانی توێژێکی باڵا بێت، بەڵکو ژیانی سادە و ئاسایی هەموو تاکێك بگرێتەوە. فیکرەیەکە کە مەسیحییەت لە ژێر چەمکی هاودەمیی بۆ نزیك و خزم دەخوێنێتەوە وەك فیکرەیەك لە بارەی پاڵەوان و حەکیمەکان، تاکە ئاساییەکان کە جێگەی ڕێزن و لە لایەن ئەوانی دیکەوە خۆشەویست و لەپێناو سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی قوربانییان داوە، یا لەپێناو ژیانی هزریدا. فیکرەی سوژە جەخت لەسەر باڵادەستیی فەزیڵەتی شەخسی دەکات و لە سەرووی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان دایدەنێ و هۆشیاریی ئەخلاقییش لە سەرووی حوکمی گشتیدا دەبینێ.



ئەم فیکرەیە لە توانایدا نییە ببێتە "بەها"یەکی سەنتراڵ و ئیحابەخشیش بێت بۆ دامەزراوەکان. ئەم گەڕانەوەیە بۆ بەهاکان، زیاد لە پێویست لە لایەن ئەو کۆمەڵگەیانەوە جەختی لێدەکرێت، کە بنەمایەکی ئایینی بە خۆ دەبەخشن، چ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بێ یا کۆمەڵگە ئیسلامییەکان و ئەم بەهاگەلە دژ بە فیکرەی سوژە دەوەستن. فیکرەی "بەرهەڵستکار"، کە هەمێشە ئاگری یاخیبوونی خۆش کردووە دژ بە دەسەڵاتی ناعادیلانە، داخوازییەکی ئەخلاقییە کە هەرگیز لە توانایدا نییە ببێتە پرەنسیپی ئەخلاقی گشتی، چونکە سوژەی کەسایەتی و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی هەرگیز ناتوانن هاوتەبا بن.

سەرچاوە

**Critique de la modernité, Alain Touraine, Fayard, 1992**

# تێڕامانێك لەسەر كێشەی
# دیار و نادیار

**بەیان سەلمان**

دیار و نادیار دەمانبەنە ناو جیهانی ئەمدیو و ئەودیوەوە. ئەم دوو وشەیە، لە زمانی كوردیدا، دەكرێ زۆر بە چاكی جێگۆڕكێیان پێبكرێ بێ ئەوەی واتایان بگۆڕێ. هەلومەرجی نادیار پابەندە بە لایەنی ئەنتۆلۆژیی ئامراز و سوژەوە، سەلماندنی بوونیان قورسە، با بەپێی پلەی كاریگەرییشیان بێت. بەم پێیە، ڕاستییەكی شاراوە هەیە، كە بۆ ماوەیەكی كاتی یان بۆ هەمیشە لە بەرچاو ونە، ئەگەرچی بە بوونی دەزانین، یاخود باوەڕمان بە بوونی هەیە.
ئەگەر چاو جێی متمانە و باوەڕ بێت، بۆچی جێی گومانیش نەبێ؟ مۆریس میرلۆپۆنتی **M. Merleau_ponty** لە





"دیاردەگەرایی بەدیکردن"دا باس لە مێزێك دەكات "(...) كە ڕەنگی قاوەییە، بەڵام چ جۆرە قاوەییەك؟ ئەوەی تیشكی پرۆژێكتۆرێكی لەسەرە و ئەو جۆرە ڕەنگەی پێدەدات؟" . میرلۆپۆنتی دواتر دەڵێ: "بەڵام ئەمە دووبارە سازكردنەوەیەكی دەستكردی دیاردەكەیە، نەك ڕاستی." . كلارا دا سیلڤا-شاراك C. D. Silva_Charrakلە "جەستە و واتا لە لای میرلۆپۆنتی" ئەم واتایەی میرلۆپۆنتی وەها لێك دەداتەوە كە "(...) چاو لە ناوەوەی خۆماندا دەمانباتە دەرەوەمان و دیسان لە دەرەوە دەمانهێنێتەوە بۆ ناوەوەی خۆمان؛ لەم پرۆسەی هاموشۆیەشدا بە نێوەندی وێنە لە بابەتەكان قووڵ دەبینەوە و دەیانخەینە بەر تیشكی خەیاڵ و دیسان بەرهەم دەهێنرێنەوە." . تەنانەت لە ڕێی ئەو وێنە نادیارانەوە خەون دەخەینە بەر شیكردنەوەی دەروونی و جفرەی سیمبولەكانیان دەدۆزینەوە، یان هیچ نەبێ، لێیان نزیك دەبینەوە. میرلۆپۆنتی لەو نووسینەی "چاو و هزر"دا ئاماژە بە پەرەگرافێكی كتێبێكی پۆل شیلدەر P.Schilderدەكات بە ناوی "وێنە و ڕووكەشی جەستەی مرۆڤ"، كە تێبینیی ئەمەی كردووە: "(...) وەستان لە بەرئاوێنە و كێشانی سەبیل لە بەردەمیدا، تەنها پەنجەكان نین كە لەسەر سبیلەكە هەست بە گەرمیی دارەكەی دەكەن، بەڵكو ئەو پەنجانەی كە لە بەردەم ئاوێنەكەدا دەبینرێن. خێوی ناو ئاوێنەكە جەستە بەرەو دەرەوە ڕادەكێشێ، هاوكات ئەو لایەنە نادیارەی جەستەشم وا دەكات هەرچی جەستەی شتەكانی ترە، لە بەرچاوم دیار بن. مرۆڤ ئاوێنەیە بۆ مرۆڤ، ئاوێنەش ئامرازێكی جیهانی سیحرییە، كە شتەكان دەگۆڕێ بۆ نمایشێك، ئەمیش دەگۆڕێ بۆ شتەكان، من دەگۆڕێ بە ئەو، ئەویش دەگۆڕێ بە من" .

هەر بۆیە، نادیار بە زەحمەت نكۆڵیی لێدەكرێ، ئەمە ڕووی شاراوەی دیار. بەو پێیە، نادیار لە سێ گۆشەوە وێنا دەكرێ: مادی، دەروونی و مرۆڤناسی، ڕۆحی. مادی لە ڕێی زانیاریی زانستییەوە پێی دەگەین. ئەو وردە ئەتۆمانەیە، كە سەرجەمی جەستەی مادیی گەردوون پێك دەهێنن. نادیار ئەو بەشە بەتاڵەشە لە ناو دیاردا، كە بوار بە ئازادیی جوڵە دەدات، وەك ئەو بەتاڵییەی لە زۆر شوێندا هەیە، وەك ئەوەی لە ناو ئاودایە و بوار بە ماسی دەدات بجوڵێ و ئەگەر ئەو نەبوایە، ئەو جوڵەیە نەدەكرا. لە سادەترین شێوەی نەبینراوشدا، بە دەرچوون لە شوێنێك بەدی دەكرێ، كاتێ ئەو شوێنە بەجێ دەهێڵی و بۆی دەگەڕێیتەوە، بە ونبوونی خۆت لەو شوێنە، خودی

شوێنەکە ون دەبێ بێ ئەوەی ڕاستیی مادیی لە دەست بدات.

نادیار لە ڕوووی دەروونی و مرۆڤناسییەوە، پێکهاتەی ڕۆح و جەستەیە. ژیل دولوز **J. Deleuze** لە وانەی "ڕاستی و کات" دا لەو بارەوە باسی ئەریستۆ **aristotle** دەکات، کە هێز و کردەوە بە هاودژ دادەنێ، دولوزیش دەڵێ هێز و کردەوە تەواوکەرن. نموونە بەرچاوەکەی لە پەیکەرێکدا دەهێنێتەوە، کە هێز لێرە بریتییە لە مادەی دارەکەی، کرداریش فۆرمەکەیەتی. هەروەها ئەم مادەیە لە کردەوەی منداڵێکدا بەدی دەکرێ کاتێ تەمەنی چەند مانگێکە و بە توانا هەوڵ دەدات گەشە بکات. هەر وەك خۆشەویستی، کە کەس لێی هەڵنایەت، کەچی کە ئاماژەی پێدەکرێ، کەس پەنجەی مادەی بۆ درێژ ناکات و بڵێ ئەوەتانێ خۆشەویستی؛ بەڵکو بەو ناوچانە ئاماژەی بۆ دەکرێ، کە فەرمانی هەست و سۆز دەردەکەن. میرلۆپۆنتی و هایدگەر بە پێچەوانەی کانتەوە، خۆیان لە نوێنەرایەتی بە نێوەندی وێنە و سیمبول و نیشانە بەدوور دەگرن. هەموو شتێك لە لایان بوونی خۆی هەیە، بگرە هایدگەر لە "بوون و کات"دا وەها باس لە دیاردە دەکات، کە لە ڕووکەش جودای دەکاتەوە "(...) ڕووکەش جۆرە خەبەردانێکە بە دەوروبەر، کە خۆی بە نێوەندی شتێك دەرخستووە. خودی ئەم دەربڕینەش (دەرکەوتن) ئاماژەیە بۆ دوو شت: کە بەو خەبەردانە خۆی دەرناخات، ئەوەی تریش خودی دەنگێکە، کە بەرگوێمان دەکەوێ و شتێك دەستنیشان دەکات، کە خۆی دەرناخات" ؛ وەك نموونەی تەقینەوەیەك، کە بە چاو نەیبینین، وەك هەواڵێك کە بیبیستین، بەڵام بە چاو نەمانبینیوە، بەڵام ئەمە نکۆڵیی لە ڕاستییان ناکات. هایدگەر تا ئەوێش دەچێ، کە باس لە خەیاڵی باڵا دەکات (المتسامی)، وەك هەموو ئەو نموونانەی کە لە پێشاندا لە خەیاڵدا وێنا کراون و پاشان جەستەیەکی مادیی وەردەگرن؛ ئەندازیاری بیناسازئاسا کە سەرەتا وێنەی بیناکە لە خەیاڵیدایە و دواتر جەستەی پێدەدات. بەو جۆرە، مرۆڤ ئەرشیڤێکی خەیاڵیی لە هزردا هەیە و بەپێی پێویست و هەلومەرج بەکاریان دەبات و بە نێوەندیان دەربڕینەکان جەستە وەردەگرن.

نموونەی نادیار هەروەها لە مەسەلەیەکی میتافیزیکیدا ئاشکرا دەبێ، لە بڕواکردن بە خوا، کەسێکی بڕوادار پێویستی بە بینینی نییە تاکو بیسەلمێنێ کە هەیە. بۆ ئەم کەسە، خوا نە زانست و نە ئایین ناتوانن بوونی بسەلمێنن، بەڵکو پەیامیان هەیە و لە ڕێی ئەو پەیامانەوە بوونی گەرەنتی دەکەن. بێجگە لەمە، لە خودی خۆیدا کە باس لە بوونی خوا دەکەین، هەر ئەم دەسپێکی تێڕامانە







دەبێتە هەوێنی سەلماندنی بوونی مرۆڤ، تەنانەت پێش مرۆڤ و هەموو کۆنسێپتەکانی گەردوونیش. هەر بۆیە، بە چوونەناو تەمەنەوە، دەبینین ئەو وێناکردنەی لە منداڵیدا هەمانبووە، لە گەورەبووندا یان دەگۆڕێ، یان بە تەواوی نامێنێ و دەمرێ.

حەز و مەیلیش هاندەری ترن، کە بەرەو ئەویتر دەمانبەن. خواستی ئەوەمان لە لا دروست دەکەن دەستی لێبدەین، دەستمان بەری بکەوێت. دەستبەرکەوتن ئەو لایەنی دیارەیە، کە باسی دەکەین. کە بینین بەشێکی گەورەی دیار پێك بهێنێ، دەستلێدان بەشێکی ترێتی. حەزیش ئەم خواستی دەستلێدانەمان لە لا دروست دەکات؛ ئەوە کە بە دەستلێدان جەستە بەویتر دەبەخشێ و متمانەمان پێدەدات لەسەر بوونی ئەویتر. هەر وەك بیرکردنەوە کە بە نێوەندی زمان دەری دەبڕین. لەم بۆچوونەوە، ئیمانوێل لیڤیناس E. Levinas لە "کات و ئەویتر"دا ڕەخنەی ئەوە لە سارتەر دەگرێ کە باسی خۆشەویستی، زمان، ماسوشیزم، بێباکی، حەز، قین، سادیزم دەکات، دەیانگەڕێنێتەوە بۆ ئەنتۆلۆژیی ئازادیی سوژە؛ ئەمەش بە ڕای لیڤیناس تەنها ئەنجامدەرە و پەیوەندییەکی وابەستەیی و زاڵبوون بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە. لیڤیناس وای دەبینێ کە پێش هەر پەیوەندییەکی ئەنتۆلۆژی، پەیوەندییەکی دەرەکی هەیە، کە بەرهەمی ناوەکییە. دەربڕین لەسەر دەموچاوی ئەویتر دەمباتەوە بۆ تەواوی بەرپرسیارێتیم، دەبێ وەڵامی بەرپرسیارێتیی ئەوانی تر بدەمەوە. لێرەدا کە لیڤیناس باسی ئەویتر دەکات، باسی ژنیش بە هەمان شێوە بە نموونە دەهێنێتەوە، بەڵام ژن نە وەك ئەوەی پێچەوانەی پیاوە یان دژێتی، نە وەك جیاوازەکانی دیکەش جیاوازە، بەم واتایەش، دەکاتە ڕووی تەواوکەر و جەندەر. دەستبەرکەوتن بەم واتایە شێوازێکە لە بوونی سوژە؛ دەستبەرکەوتن لێرە بە دوای نەرمی و گەرمیی دەستی ئەویتردا ناگەڕێ، بەڵکو جەوهەری ئەویتر پێك دەهێنێ بەوەی بەو دەستبەرکەوتنە نازانێ چی چاوەڕوانی دەکات، بەوەی "هێشتا نەبووە...". لێرەشدا لیڤیناس لە نەریتێکی ئاینییەوە باسی ئەم مەسەلەیە دەکات، کە من کاتێك دەبێ، واتە بوونی بە من دەسەلمێنرێ، کە منداڵی دەبێ. ژن بەم واتایە وەك خودی منداڵەکە خێوێکە هەتا منداڵەکەی نەبێ، بوونی نییە، هاوکات خودی ئەو بەچکەیە خێوێکە لە ناو ڕەحمی ژندا. سەلماندنی هەردووکیان لە یەك پلەدایە. ئەم دۆخی شاراوە و نادیارە بەشێکە

لە سەلماندنی دیار. دەرئەنجام، لەشی ئەویتر بە دەستبەرکەوتن جەستە وەردەگرێ، بوونی لە جیهاندا دەسەلمێ، بگرە لەدایکیش دەبێ .

لە هونەری سەماکردن و ژەنینی موزیکی هەواییدا، لایەنی نادیار لە حاڵەتی یەکەمدا جوڵەیە و لە حاڵەتی دووهەمدا خودی هەوایە. مەسەلەی نادیار لە ڕووی کاتەوە لە خودی بەرجەستەبوونی لە جەستەی مرۆڤ و ڕووەك و گیاندارەکان ئاشکرا دەبێ؛ کاتێ بە زنجیرەی لەدایکبوون و منداڵی و گەورەبوون و پیربوون دەردەکەوێ. جەستە لێرە قاوغێکە بۆ نادیاریی کات، کە بەو شێوازانە لەسەر جەستە دەردەکەوێ. بەم شێوەیە، بەپێی میرلۆپۆنتی، ئێمە ئەوانی تر هەر وەك جەستەی خۆمان لە جیهاندا دەبینینەوە. ئەم جیهانە هاوبەشەش شوێنێکە بۆ چنینی پەیوەندی بەوانی دییەوە. بەبێ ئەو پەیوەندییانە، ئێمە لە خێوێك تێناپەڕین. ئەگەر ئەوانیدی بوونیان نەبێ، منیش بوونم نییە، واتە کۆ-ئامادەبوونی هەردوو جەستەیە. ئەمەش پەیوەندییەکە، کە ستروکتورێکی بازنەیی هەیە و بەپێی میرلۆپۆنتی هەردوو جەستەکە لە سیستەمێکدا دەبنە یەك. ئیلۆدی بوولیل **E. Boulil** لە "تاك و ڕوانگەی جیهانی"دا بەپێی شیکردنەوەی دیاردەگەرایی باس لە جەستە دەکات وەك "(...) ئەو پەیوەندییە، نەك وەك شتێك، وەك ڕاستیی بوونی لە جیهاندا و پەیوەندیی بەوانی دی، کە پاتچوکە **Patoka** هەمان ڕای لەو بارەوە هەیە. ئیلۆدی بوولیل ئاماژەی بە ڕای ئەویش کردووە. جەستە لێرەدا بەو واتا فیزیکییە مەبەست نییە، کە قابیل بە نەشتەرگەری پزیشکییە، بەڵکو لە هەمان کاتدا وەك سەرچاوەیەك لە جیهاندا دەردەکەوێ و بەشدارییش لە بیناکردندا دەکات، جەستە بە هەموو هاودژییەکانیەوە، چونکو نادیار کێشەی ئەو هاودژییانەی خوڵقاندووە" .

ئەوەی دیارە، ئەو فۆرمە مادییەیە، کە نادیاری پۆشیوە، تەنانەت ناوەڕۆکی دەق، واتە ڕووداوەکان بریتین لە خێو، کەسایەتییەکان نادیارن، بینا و موبیلیا و چێشت و هەموو ئامراز و ئیکسیسواری جوانکاریی دەقێك بریتین لە خێو و لە بەرچاومان دێن و دەڕۆن، مێشکمان هەڵیاندەگرنەوە و دەبنە کەرەسەی خەیاڵ. ئەو خێوانە دەسەڵاتیان لە خودی نادیارەوە پەیدا کردووە، چونکو ئەگەر بەپێی "چێژی دەق" لە لای ڕۆلان بارت تەماشای دەق بکەین، ئەوە لە دەرەوەی نووسەرەکەی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ. نووسەر وەك جەستەیەکی مادی بە پلەی یەك و خودی کتێبەکەی بە پلەی دوو وەك سەنەدێکی مادی دەکەونە دەرەوەی پانتایی ناوەڕۆکی دەقەکە. لە ناو خودی ڕووداوەکاندا کەسایەتیی خوێنەری دەقێك دەبێتە







پلەیەکی دی لە خێوی نێو کۆی خێوەکانی دی. فیگەری خوێنەری ناو دەق (نەك خوێنەری ڕاستیی کتێبەکە) خێوی نادیاری خوێنەری ڕاستیی دەرەوەی دەقەکە بەرجەستە دەکات، هەرچۆن ئەم خوێنەرە ڕاستییە دەبێتە فیگەری ئەنتۆلۆژیی خوێنەری نادیار. لێرەدا مەبەست لەوەدا نییە جێگۆڕکێیان پێبکرێ، بەڵکو نموونەی خێوی ناو دەق و خێوی ناو خەیاڵ بەراورد دەکەین .

مرۆڤ بە نێوەندی وێنە تێگەیشتنی خۆی دەربارەی جیهان و بەهای شتەکان دەردەخات. بەمادییبوونی ئامراز و کەلوپەل بەشێکە لەو وێنەیە. دواجاریش هەموو ئەوانەی ئاماژەمان پێکردن، بە نێوەندی زمان و زمانێکی تایبەتیش دەریان دەبڕین. لێرەشدا زمان بەرپرسیارە لە گواستنەوە بە شێوەیەکی دروست. ئەوەی دیارە، لەوانەیە لە چرکەیەکدا بگۆڕێ بۆ نادیار کاتێ لە خودی بیرکردنەوەشدا وشەکان ناڕوون بن و لە ناو ڕستەی ئاڵۆزدا ڕیز کرابن. ئەوەندەی دەربڕین لەم دۆزەدا دەبێتە ناڕوونی، خودی بابەتەکە لەو نێوانەدا ون دەبێ، چونکو دەکەوینە ناو لێکۆڵینەوەیەکی بێهودە لە واتایەك، کە بە تەواوی دەیگۆڕێ بۆ بێواتایی.

کە خەون بریتیبێت لە کۆی ئەو ڕووداوانەی پاشەکەوت کراون و بە وێنە بەرهەم دەهێنرێن، لە کۆتاییشدا دیسان بە نێوەندی زمان بەرهەم دەهێنرێنەوە. ئیدی لێرەدا ئەو زمانە ئاکتەرێکە، گوتارێکی زارەکی بەرهەم دەهێنێ، یان دەقێکی نووسراو، یاخود تابلۆ و شانۆگەریی و فیلم و هەر بابەتێکی تر بێت. زمان دەبێتەوە کردارێك بۆ دەربڕینی بینین، دەربڕینێك کە زۆر دوورتر دەڕوات و تەنانەت دەگاتەوە ئەودیو و دەڕوانێتە ئەودیو و شتەکانمان بۆ دەگوازێتەوە. لێرەشدا، گرنگە شتەکان وەك خۆیان نەگوازێتەوە، مەودایان لێ وەرگرێ، لێیان ڕامێنێ و بە یاسای نوێ دایان بهێنێتەوە. ئەم تێڕوانینەش، ئەگەر نەڵێم ناکات، دەڵێم هاودژی ئەو بۆچوونەیە، کە دەڵێ: "چاو پەنجەرەی ڕوحە"، چونکە خودی چاو دەمانباتە ئەودیوی ڕوحیش، تا ڕادەیەك دەبێتەوە فاکتەرێکی دەرچوون و داماڵین لە خود، هەڵماندەداتە ناو دونیایەکی دی، جیهانێك تایبەت بە خۆمان، بەڵام نەك تەنها بۆ خۆمان، بەڵکو هانمان دەدات بیر لەوی تر بکەینەوە و بۆچوونمان بەرفراوانتر بێت. ئەکتەر و دەرهێنەری سینەمایی ئەمریکی ودی ئالن دەڵێ: "تاقە پەشیمانیم لە ژیاندا ئەوەیە کە ناتوانم ببمە کەسێکی تر". ئەم بۆچوونە لەوەوە هاتووە، کە

جێگۆڕکێی شوێن بۆ کەسێکی دی بۆچوونیشمان دەگۆڕێ، دەبینە کەسێکی تر و باشتر خۆمان دەناسین و ئەویتریش. نادیاریش هەر بەم شێوەیەیە، لە دۆخی داخراوی بەدوورمان دەگرێ و ئەوە کە دەبێتەوە بە کراوە لەسەر جیهانێك، کە خەونی پێوە دەبینین، وەلێ نایبینین، یاخود بەو جۆرە دەیبینین، کە تەماشای ئاسایی و سادەی ڕەت داوەتەوە و بەرەو هزرگەرایی دەمانبات.



سەرچاوەکان:

Clara Da Silva-Charrak, Merleau-Ponty, le corps et le sens, Éd. PUF, Paris, 2005 pour l’option citée par -

Bénédicte Mathios en : « Une lecture de l'oeuvre d'Ángel González: corps et écriture poétique » Livres

.électroniques sur google: Presses universitaires de France, 2005

.Emmanuel Levinas, Le Temps et l'Autre, Montpellier, Éd. Fata Morgana, Paris, 1980 - PUF, Paris, 2011 -

.Emmanuel Levinas, Totalité et Infini, un essai sur l’extériorité, Éd. Le Livre de Poche, Paris, 1990 -

Elodie Boulil, Individuation et vision du monde: Enquête sur l'héritage -

ontologique de la phénoménologie (Préface de Natalie Depraz) Éd. ZETA Books,

.2014

Gilles Deleuze - vérité et temps, cours 58 du 20/03/1984 - 2 transcription : -

.M. Sarrazin. Paris

La Main 2/4: Du toucher à la caresse : Sartre et Merleau-Ponty, 13.09.2011 -

– 10h:00. Adèle Van Reeth a reçu : Clara Da Silva et Philippe Cabestan

.Radio France Culture, Paris, France

Martin Heidegger, Être et Temps, trad. Emmanuel Martineau, Paris, -

.(Authentica, 1985 (lire en ligne) (éd. hors-commerce





- Maurice Merleau-Ponty, L'Œil et l'esprit, Éd. Gallimard, 1960.

- Maurice Merleau-Ponty, La Phénoménologie de la perception, NRF, Éd. Gallimard, Paris, 1945.

- Maurice Merleau-Ponty, Le Visible et l'invisible, publié par Cl. Lefort, Gallimard, Paris, 1964.

- SCHILDER Paul, The image and appearance of the human body, New-York, 1935, réed. 1950.



# دەروونڕۆشنیی شیعری

## سەباح ڕەنجدەر

لە شیعردا بیرێك هەیە، تایبەتە بە شیعر خۆی. نە فەلسەفەیە، نە ئایدیۆلۆژییە، بەڵام هەموو پێکهاتەکانی شیعری تێدایە.
نووسین ژینگەیەکی جوان و ئارامە بۆ ژیان و ئەشق، ئەشقیش باشترین بارودۆخی مرۆڤە بۆ نووسین. ئەشق سەرچاوەی بوونی دەروونییە. بەملاوئەولا نایەتە دی، بەڵکو دەبێت شاعیر لەم دۆخی بوونی دەروونییەدا بژێت و بتوێتەوە، خۆی دابڕێژێتەوە و ببێتەوە دڵۆپە و بێتەوە ناو سەرچاوەی خودناسین و خۆناسین و دەروونڕۆشنییەوە. ئەوجا ئەشقییەتی شیعری خۆی دابڕێژێت. هەر ئەشقییەتی شاعیرانی ڕۆشنەدڵیشە شیعریان بە ڕووناکی هێشتووەتەوە، شیعریش لە دەرکەوتنی خۆی بەردەوامە و بە هەموو شانازییەکەوە ڕێزێکی تایبەتی لێدەگیرێت. من ئەگەر بیرێك و ئامادەیی زەینیم نەبووبێ و ڕووداوێك لە هەستم ڕووی نەدابێت، بە هیچ شێوە و شێواز و بەهانەیەك شیعرم نەنووسیوە، کە خولیای نووسینیش دام دەگیرسێنێت و دۆخم بۆ دەڕەخسێنێت، لەگەڵ دەروونی خۆمدا زۆر تەبا دەبم و بە ئارامی هەڵدەکەم. هێزی خود هەموو هاوسۆزییەکانم بانگهێشتی ڕەخسانی دۆخەکە دەکات. من سەرەتای

شیعر بە کۆمەکی سرووشێکی نیمچەڕوون، بە سادەیی دەکەمەوە و گرانایی و بەهای شێواز و ڕەگەزی کتوپڕی دەخەمە ناوەند و وەك ناوەندێك دای دەمەزرێنم، دووبارە سادەیی سەرەتاکە دەخەمەوە دواوێنەوە. بڕواشم وایە شیعر دێت و خۆیم پیشان دەدات. ئەوجا بە دوایدا دەچم و دەگەڕێم و کۆششی بەرجەستەبوونی بۆ دەکەم و وشە زاخاو دەدەم و خوازیاری گەشەسەندن و نوێبەخشی دەبم و هێڵێکی یەکگرتووی شێواز و زمانی تێدا دەخەملێنم. شیعری بێگەرد تەنیا لەسەر بنەمای جیهانبینیی ڕووناکیی خۆتدا، خوداناسین و خۆناسین و دەروونڕۆشنی، کە لە ئەزموونی ژیانەوە پێی دەگەین، دێتە بەرهەم. دوای هاتنەبەرهەمم بە ڕەنگ و ڕوخساری خۆتەوە تێکەڵ بە ڕەنگ و ڕوخساری ئەوانی دیکە دەبێت، واتە کولتووری کۆمەڵگەی خۆت. ئەم جۆرە دۆخگۆڕین و گواستنەوەیە خەسڵەتی ئەدەبیی ئێستێتیکییە و هێزی دەروونی بە مرۆڤ دەدات. هەنگاو بە هەنگاو خەسڵەتەکانی خۆی لە دەروونی مرۆڤدا دەپارێزێت و بۆ قووڵترین گۆشەی دڵ دەگەڕێت و باری هەستیاری دەخەملێنێت، گۆڕانیش لە باری کامڵبوونەوە ڕوو دەدات.

من زیاتر لە بۆچوون و شێواز و حاڵوبارەکانی تر، ئارەزووم بۆ خوێندنەوەی ئەو شیعرانە گەرم دەبێت و پێیان دەدرەوشێمەوە و بە جۆر و جوانیان دەزانم، کە شاعیرەکانیان لە حاڵوباری ناڕێکیی سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات لە ناو کۆمەڵگەی خۆیاندا دووچاری نامۆیی بوونە و پەنایان بردووەتە بەر تاراوگەی ناخ و پەناگە و مەئوای ناخ، ئەم پەنابردنە ئازادییە. ئازادیی تەواوی نووسین. لەم حاڵوبارەدا دەچنە قووڵایی بەسەرهاتەوە و گۆڕانێکی قووڵی نیمچەڕیشەیی فیکری و ڕۆحی لە شاعیردا خۆ دەردەخات. بەشێك لە خوێنەرانیش پێش هەموو شتێك بابەتی ئەدەبی بۆ ناوەڕۆك دەخوێننەوە، بەڵام من پێش هەموو شتێك ئەدەب بۆ ئێستێتیکای زمان و ئێستێتیکای ئەدەب دەخوێنمەوە. هێزی ئەدەب هەر لە ناڵە و هاوار و دەنگی بەرزبوونەوەی کارەسات و نزمبوونەوەی کارەساتدا هێزی زرینگانەوەی پەیدا ناکات و دۆخ وەرناگرێت، هەروەها مانا بە باری یەکئاستی ناخەمە ڕوو، بەڵکو خوێنەر دەتوانێت لە ترپە و ئاوازی شیعرەکەدا، بە دەروونڕۆشنیی شکۆی شیعرییەوە بۆی بگەڕێت.

لە شێوەی دەربڕیندا، ڕووداو و حاڵەت هێزی زمان وەردەگرن و دەیگوازنەوە بۆ هێزی ئێستێتیکای ئەدەبی. هەوڵ دەدەم داوا و داخوازیی شیعر لە زمان بزانم و لە زمانی دێرینی کوردییەوە وشە و دانەپەیڤ بدۆزمەوە و ئەزموونی خۆمی پێ بەڕێوە





ببەم و لەگەڵ پێکهاتەی ڕێزمانی نوێشدا بیگونجێنم و ڕایەڵیان لە نێواندا دروست بکەم. بە تایبەتی زمانی بەیت و شیعری کلاسیکی. مەرجیش نییە وەك ئەو هەبووەی بەکار هاتووە، بەکاری بهێنمەوە، بەڵکو دەیکەمە سرووشی هێزی زمان و بنچینەی پێکهاتە، دەتوانێت قووڵترین خاڵی ژیان بدۆزێتەوە و بەهرەی لێ وەربگرێت. شیعری بێگەرد لە پێکهاتەی زماندا خۆی دەخاتە ڕوو، زۆر بە کەمی لە ناوەندی شیعری کوردیدا ڕێکەوتی شیعرێك دەکەیت، شیعرییەتی تێدا بێت و بە ئاستێکی کەمی زمان خۆی خستبێتە ڕوو، هەروەها بەشی هەرە زۆری شیعری ئەمڕۆی کوردی ناشێت بە کاری ئەدەبییان دابنێین.

هەموو وشەیەك توانا و هێزی ئێستێتیکیی شیعریی تێدایە بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردن. وشە لە خراپ بەکارهێنانیدا هێزی ئێستێتیکیی دەکەوێت و لە باش بەکارهێنانیشیدا هێزی ئێستێتیکیی دەردەکەوێت. زمانی کوردی زمانێکی شیعریی دەوڵەمەندە و شاعیری لێزان و باڵا بەرانبەری لارەمل و دەستەوەستان نابێت، هەروەها وشەش نارەنجێنێت، وشە هێزی شیعر دەپارێزێت و شیعرییەت دەبەخشێت. هەستی زمان فریای شاعیر دەکەوێت و هێزی خەیاڵی دەدرەوشێنێتەوە. زۆر پابەندم بە هێزی هەست و زمان و ڕێکخستنی پێوەندیی نێوان وشە و دەستەواژە و ڕستە. بنچینەی شیعر هەست و زمان و مۆسیقایە، هەست و زمان و مۆسیقاش واتای نوێ لە واقیع و خەیاڵ دروست دەکەن. لە هەندێك ڕستەمدا دەنگی مۆسیقا بە ئاسۆیی دێتە گوێ، لە ڕستەی ترمدا بە ستوونی دەبیسترێت. ئەو مۆسیقایە بە دڵێکی تەواو کوردییەوە لە ناخی خەڵك و قووڵایی زەوییەوە ترپە و ئاوازی وەرگرتووە و هاوخەمی و هاوشادیی جیهانی پێك دەهێنێت و فۆرم دەگرێتە خۆی.

هەست، وزە و تینی کارای نووسینی ئەدەبییە و بنەڕەتی هەموو چالاکییەکانی شیعرە. شیعری هەستیش ڕەنگی ژیان دەداتەوە. هەموو مرۆڤێك خاوەنی هەموو هەستە سروشتییەکانی، یان لایەنی کەم، بەشێك لە هەستە سروشتییەکانی خۆیەتی، بەڵام هەموویان توانای باش بەکارهێنانیان نییە. جیاوازیی داهێنەر لێرەدا دەردەکەوێت. ئایا بە باشی و سادەیی ئەو هەستانەی دەهێنێتە ناو نووسین و دۆخێکی گونجاوی بۆ دروست دەکات. شیعری کوردی بە چەندین ناو، کە هەستە سروشتییەکانی

خۆیان باش و بە سادەیی بەکار هێناوە، درەوشاوەیە. شیعری سادە وەك شەپۆلێکی هەستی دەبێت زۆر داهێنەرانە لە دۆخی هەستیاردا بنووسرێت و خۆی دابمەزرێنێت، دەنا ئاسۆ و دوورییەکی نابێت بۆ لێکدانەوەی جیاواز و ئاستدار. نموونە: دوو نامەکەی (نالی) و (سالم)، یان دوو گەشتەکەی (گۆران)، یان (چۆن کپ ئەبم)ی ئەنوەر قادر محەمەد، یان (بتانەوێ و نەتانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان نالی هەر بۆ شارەزوور دەگەڕێتەوە)ی لەتیف هەڵمەت، یان (گورگ)ی محەمەد حەمەباقی، یان (کۆست و چرا)ی شێرکۆ بێکەس، یان (هەولێر لە یەکی شوباتا)ی عەبدوڵڵا پەشێو... لە دەربڕیندا پڕاوپڕن لە تووڕەییەکی ئاشکرا و سادە، بەڵام لە دۆخی هەستیاری و داهێنەرانە بە سەرچاوەی ژیانی کۆمەڵگەوە نووسراون و لێکدانەوەی جیاواز و ئاستدار وەردەگرن و ڕوخساریان شکۆی شیعرییەتی تێدا خەملیوە. بەوەی هەم لەسەر زەینییەت و هەم لەسەر واقیع وەستاون و خوێنەریش ڕووداو و وێنە زەینییەکان قبوڵ دەکات. ئەمە مەترسییەکی گەورەیە و پێویستی بە ئاگاییەکی قووڵ هەیە لەسەر دوو ئاڕاستە کار بکەیت و خوێنەریش ناچار بکەیت هەردوو ئاڕاستەکە وەربگرێت و بینینی خۆی لە ناویدا ڕوون بکاتەوە. ئەم نموونانە بە شێوەیەکی بینراو و نەبینراو دەربڕین لە ناوەندی نەتەوایەتی دەکەن و ڕۆحی نەتەوە تێیاندا ڕەنگی داوەتەوە، خوێنەریش زۆرتر بە هەستی نەتەوایەتی، نەك ئێستێتیکی لەگەڵیاندا دەخرۆشێت. من بە تەواوی هەستەکانم ئاوێتەی ئەو دەقانە بوون، بەمەش خۆم بە شێوەیەك لە شێوەکان بە نووسەریان دەزانم. بەها و جوانییەکی پێویست و نایاب هەیە خۆت بە نووسەری دەقی شاعیری جگە لە خۆت بزانیت. ئەو دەقانەی شاعیرانی تر خۆزگەیانە خۆیان بە نووسەری بزانن بەها و جوانییەکی بێهاوتایان بەخشیوە و بوونەتە ئەفسوون و زایەڵەیەکی سەیر لە بوونی ڕۆشنبیریدا. ئەوە گەوهەری داهێنانە دەبریسکێتەوە و شاعیران بۆی غار دەدەن بیگرن و بە هیی خۆیانی بزانن. ئەو شاعیرەی گەرمایی ئەو خۆزگەیەی لە دڵدا خاو بووبێتەوە، شاعیرێکی کلۆر و مردۆخ و پووخە و لەپەلوپۆکەوتووە.

لای ئێمە ژمارەیەکی کەم و دیارکراو شاعیرە هەرە نوێیەکانمان و چەند سەد کەسێکیش بەرهەمی شاعیرە کۆن و ناسراوەکانمان دەخوێننەوە. من باوەڕم بە هونەر بۆ هونەر، یان هونەر بۆ دەستەبژێر، یان هونەر بۆ کۆ و کۆمەڵگە، یان هەرشتێکی لەم بابەتە و لەمە نزیك نییە. هونەر، یان دەبێت نەبێ، یان ئەگەر هەبوو، دەبێت هونەرێکی پاك و بیرکردنەوەیەکی بنەڕەتیی ئێستێتیکی پەتی بێت. هونەری پاك و پەتییش لە خۆیدا لە خزمەت و پێناو کولتوور و کۆمەڵگەی تەندروستە.





ئەوی تر جۆرێك ڕووپۆشكردن و لەخشتەبردنە. بە هیچ شێوە و شێواز و بەهانەیەك بە ئاسانی خوێنەر گیرۆدەی شێواز و گیرۆدەی مانا ناکەم، دەمەوێت خۆی، خوێنەری نموونەیی، هەڵکۆڵین لە دەق و شێوازی نووسیندا بۆ گیرۆدەییەکانی خۆی بکات. شاعیری ڕاستەقینە کار بۆ لایەنێکی سیاسی یان ڕەوتێکی سیاسی ناکات، بەڵام دژی ناپاکیی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ئێستێتیکی کاری ئەدەبیی خۆی بەڕێوە دەبات. لە ناو جەنگەی ئاڵۆزیی سیاسەتدا لایەنگیریی ئاشتی و لێبووردەیی دەکات. شیعری من بەتینوتاوی هەمەچەشن دەربڕینی لە شەڕی ناوەکی کردووە و لە زۆربەی زۆری ئەزموونیشمدا تیشکدانەوەی هەیە، بەڵام لە هەموویان دەرکەوتووتر دەقی (مەرگی ئاوێنە)یە. هۆکارەکەشی ئەوەیە، کە شەڕی ناوخۆیی وێرانکاری لە ڕۆح و فیکری کۆمەڵگەی کوردیدا دروست کرد و ناخی کەواند. هەمیشە بەو بارەشدا کارم کردووە، وێرانکارییە ڕۆحی و فیکرییەکان لە ئێستێتیکای ئەدەبدا گەش بکەمەوە و دۆخی ئاشتی و لێبووردەیی وەك خاڵی بینین بهێنمە ناوەوە.

لە شیعردا بیرێك هەیە، تایبەتە بە شیعر خۆی. نە فەلسەفەیە، نە ئایدیۆلۆژییە، بەڵام هەموو پێکهاتەکانی شیعری تێدایە.

دەسەڵات، دەسەڵاتسالاری، یان دەسەڵاتسەرووەرییەك شتی لە شیعر و شاعیرە ڕەسمییەکان داوایە، کە لە بەرژەوەندیی ئەودا بن و ئەدەبێکی مەبەست سیاسی بەرهەم بهێنن. ئەدەبی مەبەست سیاسیش کاردانەوەیە بەرانبەر هۆکار. شیعری بێگەردیش یەك ئەرك کرۆکی بێگەردی دەستنیشان دەکات، کە لەپێناو ئێستێتیکای زمان و ئێستێتیکای پەتیدا کاری خۆی بەڕێوە ببات. هێزی هەستی مرۆڤانەی بە هۆی هێزی زمان لە هێزی وێنەدا پێشان بدات. زمان و مۆسیقا و وێنە سێ گۆشەی ڕووناك و گرینگن بۆ شیعری بێگەرد و خوداناسین و خۆناسین و دەروونڕۆشنیی شاعیر. دەسەڵات زۆر بە ڕێکوپێکی و لێزانانە و بە مەرام کار لەسەر هەڵکۆڵینی کرۆکی شاعیری ملنەرم دەکات بۆ مەرام و ئەو تێگەیشتنەی خۆی. هەر شاعیرێك خراپ بنووسێت و زمان خراپ بەکار بهێنێت، خیانەتکارە لەگەڵ خاك و کولتوور و کۆمەڵگەدا، چونکە زمان تاکە بەروبووم و سەرچاوەی خاك و کولتوور و کۆمەڵگەیە. شاعیری داهێنەر ڕووداوە وردەکان و دیاردەکانی ڕۆژانە دەگوازێتەوە ناو هەستیاریی زمان و لە شیعرییەتدا دایان دەمەزرێنێت. لە ئەدەبی ئێمەدا زۆر

شاعیر هەن زۆر ملنەرم و دەسەڵاتین. بەوەی لە پۆستی بەرز دانراون. ئەگەر ئەو پۆستە بەراورد بکرێت بەوەی ئایا بە هۆی ئاست و توانای ئەدەبی وەری گرتبێت، ئەوەت بۆ دەردەکەوێت سەداسەد لە جێگەی شیاوی خۆیدا نییە و زۆر لاسەنگە، چونکە شاعیری لەو زۆر بەتواناتر، لە ڕووی ئێستێتیکای زمان و ئێستێتیکای پەتیدا هەن لە پێچانەوەی دەسکە سڵقێکیشدا جێگەیان نابێتەوە. ئەم کردە، یان کارە بوونەکەی لەسەر شێوازی تاکتیکی سیاسەت و دەسەڵاتسالاری، یان دەسەڵاتسەرروەری وەستاوە و بەڕێوە دەچێت. نەك ڕۆشنایی بەرهەم و بوونی ئەدەبی. بڕواشم بەو شاعیرانە نییە، شیعری مەبەست سیاسی دەنووسن و دەڵێن: ئەگەر گۆڕانێك لە ناو کۆمەڵگە ڕوو نەدات و ژیان بەرزی و نزمیی تێنەکەوێت، شیعر شتێکی نابێت بیدۆزێتەوە. ئەدی لەم حاڵوبارەدا کاردانەوەی هێزی خود و هێزی خودناسین و خۆناسین و دەروونرۆشنی چییە.

لە دنیادا تەنیا یەك شت نایەتە دی، ئەویش ئەو شتەیە، کە هەوڵی بۆ نادەیت. مرۆڤ گەردوونێکی بچووکە، لە نووسیندا کۆمەڵگە گەردوونەکەی دەناسێت و دەیکاتەوە. لەو کاتەوەی ڕاست و چەپی خۆمم ناسی و هەستم کردووە چی دەمخاتە سەر دۆخی خۆدەستنیشانکردن، دەسەڵاتی ڕووناکیی شیعر بانگی ناو خۆی کردم و هەستم کرد مانەوە لە ناو ئەو ڕووناکییەدا، مانەوەی بوونی منە وەك مرۆڤێکی هەستی و خودناس و خۆناس و دەروونرۆشن. بۆیە تەواوی وزەی خۆم بۆی تەرخان کرد و هەموو شتێك و خولیا لاوەکییەکانم پەراوێز خست و چوومە ناو دەسەڵاتی نووسینی بێگەردەوە.

ئەم بڕیارە و چرکەساتی ئەم بڕیارە، ئاکام و ڕووداوێکی زۆر گرینگە بۆ نووسین و خۆدەستنیشانکردن و بەردەوامی و خستمیە سەر دۆخی نووسین و مانەوە و جۆرێك بەرپرسیاریەتیی ئێستێتیکیی ئەدەبی. هەموو شیعرێکی ئێستێتیکی جۆرێکە لە بیرکردنەوە و ئاکامی بیرکردنەوە. بیرکردنەوەش وەك ناوەندێك وەردەگرێت و هەست دەخاتە جێگەی هێما و مەجاز، هەروەها ئەدەبی ئێستێتیکی دەربڕین لە دڵەڕاوکێ دەکات و ڕووبەڕووی بوون دەبێتەوە. دڵەڕاوکێ بەرانبەر بەرزی و نزمییەکانی ژیان، لە هەندێك حاڵوباردا مانا لە ژیان وەردەگرێتەوە و دەیکات بە شتێکی هیچوپووچ و بێبایەخ، لە هەندێك حاڵوباریشدا دەیکات بە سەرچاوەیەك و پلەیەکی درەوشاوەی شیعرییەت و دۆزینەوەی گەوهەری نادیاری. ئەگەرچی دڵەڕاوکێ لە ئەدەبی کارادا مەسەلەیەکی دێرینە و بەردەوام لە بوونی شاعیردا





بەرانبەر شتێکی نادیاریکراو، یان ئایینده‌یەکی میتافیزیکی دووبارە دەبێتەوە، هەروەها هانا و پەنایەکی ئەزەلییە بۆ شاعیری هەستی. من زۆر لەگەڵ دەقەکانمدا دەمێنمەوە. لێرە وشەیەکی دەگۆڕم و لەوێدا جێگۆڕکێ بە ڕستەیەکی دیکەی دەکەم و پێکەوەیان دەبەستمەوە و بیر لە هێزی زمانەوانییان دەکەمەوە. پاشان بیر لە پێوەندیی وێنەکان دەکەمەوە و بیر لەوەش دەکەمەوە بزانم ئەوەی بیرم لێی کردووەتەوە، ئەم دەقە ئەوەیە، یان دەقێکی ترە و ئەفسوونی زمان و هەست لە کاتی خورپەی نووسیندا خۆی زاڵ کردووە، بەڵام دامەزراوەکە ئەو بناغەیەیە، کە یەکەم خورپە لە شیعردا بە ڕوونی هەست پێدەکرێت و وەك ناوەندێك دەمێنێتەوە و ڕەگ بە تەواوی جەستەی دەقەکەدا شۆڕ دەکاتەوە و وەك هێزێکیش ڕای دەکێشێتەوە ناوەوەی خۆی و زاخاوی دەدات. ڕەشنووس لە سەرمێزی نووسینمدا زۆر دەمێنێتەوە و کەڵەکە دەبن، چەند بمێننەوە، ڕەنگیان جوانتر دەخەمڵێ و هۆگریم بۆیان زیاتر دەبێت. دەقم هەیە دە جار زیاتر نووسیومەتەوە. لە دواپاکنووسدا بە هەموو ڕەشنووسەکاندا دەچمەوە بەیەکیان دەگرم و سوودی زۆر لەم پێداچوونەوە و پێکگرتنەدا وەردەگرم. وێنە هەیە دوای ئەم هەموو ئاڵوگۆڕییە، وێنەی یەکەم ڕەشنووس دەهێنمەوە و لەسەر ئەو سەقامگیر دەبم و ئەوانی تر دەخەمە لاوە، بۆشم دەردەکەوێت یەکەم داڕژان لە شیعردا زۆر گرینگە، پێداچوونەوە و پێکگرتنی دەقیش بۆ مشتوماڵکردن و جوانکاری هێندەی نووسین گرینگە. نووسین خۆی پێداچوونەوەیە بە خوداناسین و خۆناسین و دەروونڕۆشنی، هەروەها پێداچوونەوە پشووی دوای نووسینە و خۆشیبەخشترین چرکەساتی شاعیرە و هەموو خۆشحاڵییەکانی تێدا کۆ دەکاتەوە.

زیاتر لە پەنجا ساڵ بەسەر مەرگی (گۆران)دا تێپەڕیوە، کە (**18/11/1962**)ە. تا ئێستاش لێتۆژینەوە گرینگەکانی لەبارەی شیعری نوێی کوردی پێشکێش کراون، ئەوانەن کە لەبارەی گۆرانەوە نووسراون. هەروەها خوێنەریش، یەك لەوانە من بە تەواوی هەستەکانمەوە گوێ لە ترپەی دڵ و ناخی بەهێزی دەگرم و سرووش لە ڕۆحی گەرمی وەردەگرم. کەواتە تاکو ئێستا ڕێبازی گۆران ڕێبازێکی دانپێدانراوە و قۆناخی حەفتا و هەشتاکان و ئەوانی دیکە بە شێوەی دامەزراوی گۆران دانپێدانراو نین، یان خەسڵەتە گرینگی زمانی و ئێستێتیکییان دەستنیشان نەکراون، یانیش شاعیرێکی گۆڕانکار و بەزەبر

لە کێشی گۆران پەیدا نەبووە. یان قۆناخەکان قۆناخی بەکۆن و چەند کەسانێك لە بنیادنان و سیمادارشتنیان هاوبەشن، بۆیە بایەخدانەکە دابەش بووە بەسەر کەسە هاوبەشەکان و تاك وەك دیاردە و ڕووداو دەرنەکەوتوون.
ئەگەرچی من بڕوام وایە شیعری بێگەرد سەر بە هیچ قۆناغ و قوتابخانە و ڕێباز و بزوتنەوەیەك نییە و بەرهەمی ئەزموونی تایبەتی شاعیری ڕاستەقینەیە لە بەهرەی ئەدەبی و چێژی ئەدەبی و دۆزینەوەی ئێستێتیکای ئەدەبی، هەروەها بڕواشم بەوەیە دەبێت شیعرێکی تر، واتا شێوازێکی تر لە شیعری کوردیدا سەرهەڵبدات. شیعرێك ببێتە سەرکێشییەکی درەوشاوە بۆ ئەو جۆرە شیعرەی هەیە و لە ناخەوە ڕایوەشێنێت و ئاگاییەکی ئێستێتیکیی بداتێ. ئەم سەرکێشییە پێویستە لە هەموو سەردەمەکان سەرهەڵبدات و بەردەوامیی هەبێت. زۆر لەگەڵ ئەوەدام سەرکێشییەك سەرهەڵبدات و شیعری نەوەی ئێمەش ڕاوەشێنێت. ببێتە ئاماژەیەك بۆ گۆڕانکاریی شیعری. هەڵبەتە ئەم گۆڕانکارییە بە چێژی زمان و چێژی ئەدەب دێتە ئاراوە. نەك وەك گۆڕانکارییەکی مەبەستدار و نەخشە و پلان بۆ دانراو. واتە ئەزموونی ئەدەبی زاخاوی بدات. شاعیری گۆڕانکار لەخۆڕا و بە ڕێکەوت و ئەڵڵاخودایی نابێتە گۆڕانکار، بەڵکو پێویستی بە ڕێکخستنی سیستەمی ناخ هەیە. من جیاوازیی زۆر جوان لە نەوەی دوای خۆم دەبینم. لە هەندێکیان وەك جیاوازی و لە هەندێکیشیان وەك داهێنان. هەمیشە بە بینینی ئەم جۆر و جیاوازییانە دڵخۆش دەبم. بە هیوام ئاگریان بەتینتر بێت بۆ بەخشینی ڕووناکیی شیعرییان و مستەکۆڵەیەکی ئێستێتیکیش بن بۆ ئێمەمانان. شاعیری جیاواز (ئاریان ئەبووبەکر) لە ساڵی **2013** لە سلێمانی لە حەڤدەیەمین فیستیڤاڵی گەلاوێژدا شیعرێکی بە سەرناوی (قاچ، ئوتۆمبێل) خوێندەوە (من و ئیسماعیل حەمەئەمین) لە شکۆی ئەم شیعرەدا لە ناو جەماوەر هەستاینەوە و بە پێوە وەستاین تا شاعیر لەسەر شانۆکە هاتە خوارەوە لە ناو هۆڵدا لەسەر کورسیی خۆی دانیشت.

بە درێژاییی ئەو سی و چەند ساڵەی سەرقاڵی شیعرم، خۆم لە دوو شت بەدوور گرتووە و لێیان دەسڵەمێمەوە.

یەکەم: چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی.

دووەم: وەڵامدانەوەی ئەو نووسینانەی بە هەڵە لە ئەزموونی من دواون.

تەلیسمی ئەم نهێنییەشم بۆ ناشکێت. باشیش لەوە گەیشتووم هەڵەی کوشندەی نووسەر ئەوەیە خۆی سەرقاڵی هەڵەی نووسەرێکی تر بکات. ڕەنگە هەر ئەم تێگەیشتنەشم بێت تەونی نهێنیی ئەم ترسەی بۆ چنیبم.





یەك لە چێژە ئەدەبییەكانم بەبێ ئەوەی خۆم هیچ ویست و دەسەڵاتێكم تێیدا هەبێت، هەڵدەبزڕكێت، بەوەی هەر كاتێك شیعرێك بۆ گۆڤار، یان ڕۆژنامەیەك دەنێرم، دوای ماوەیەك بڵاو دەكرێتەوە. هێندە بە بڵاوكردنەوەكە دڵخۆش دەبم و دەكەومە حاڵوباری ئارامییەوە، هێندەی تریش دڵگران و سەغڵەت دەبم بەوەی دەبینم وەك هاوتایەك هێڵكاریی لەگەڵ بڵاو كراوەتەوە. هەندێك جاریش هێڵكارییەكە زۆر نایابە و وەك بابەتێكی سەربەخۆ چێژی لێ وەردەگرم و لە هێڵ و هێمای ورد دەبمەوە و دەچمە ناو كەشێكی ئێستێتیكیی تایبەتەوە.

من بڕوای تەواوم بەوەیە شیعر خۆی هێڵكارییەكی هەستییە و تێیدا خودێكی خوداناس و خۆناس و دەروونڕۆشن دەردەكەوێت. نەشیاوە هێڵكارییەكی تری بخرێتە پاڵ و قەڵەباڵغ بكرێت و لەبەریەكیان ڕابگریت، چونكە هیچ پێوەندییەكی گرینگ و جووڵە و ژیانێكی تازە و ئاشكراكردنی هێڵ و هێمایەكی شاراوە نادەن بە شیعرەكە. شیعر و هێڵكاری هەریەكیان خاوەن گۆشەنیگایەك و هەست و فامكردنی خۆیانن، بە هۆیەوە زمان و ئاخاوتن و هێڵ، كە بوونەتە بابەت، دەستنیشان دەكەن.

لە هێزی دەربڕینی خۆیاندا، هەریەك سەربەخۆیی خۆیان لە پێشكێشكردندا دەپارێزن. هیچیان بە هۆی ئەوی تریانەوە هێزی دەربڕین و ئێستێتیكی وەرناگرن و ڕووناكییان داناگیرسێت. هەرچەندە بۆچوونم بەرانبەر هێڵكاری ڕوون و ڕەوانە و پەنهان و شاراوە نییە، بەڵام ڕۆشنڵ دەبم بزانم شێوەكارەكە تێگەیشتنی بۆ شیعر چییە و چ پێوەندییەكی پێیەوە هەیە و شیعر لە چاوی ئەودا چۆن دەردەكەوێت. شیعر هەیە لە چەندان وێنە و دەربڕین و بیروبڕوادا پێك هاتووە. ئایا هێڵكارییەك دەتوانێت ببێتە دەربڕینی بیروبڕوا و ئێستێتیكی هەموو ئەو وێنانەی شیعرەكەیان پێك هێناوە؟ تكام وایە لەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی شیعریان تێدا بڵاو دەكەمەوە، تا بكرێت هێڵكاری لەگەڵدا دانەنێن، چونكە نە شیعر و نە هێڵكارییەكە دنیا ناخەنە ناو لەپی دەستمانەوە، بەڵكو نیشانەكانی ئەم دنیایەن.

لە شیعردا بیرێك هەیە، تایبەتە بە شیعر خۆی. نە فەلسەفەیە. نە ئایدیۆلۆژییە،
بەڵام هەموو پێكهاتەكانی شیعری تێدایە.

ئەیلوولی **2014** هەولێر

كتێبی گیرفان

135

# ڕۆبێرت مانتران

# سەرەتاکانی پرسی ڕۆژهەڵات

لە فەڕنسییەوە

د. نەجاتی عەبدوڵڵا





# نەتەوەی زێرابەکان

جابار جەمال غەریب

## خوێندنەوەی کتێب



# ئاسەوارەکانی جەنگ و مەرگی بەختەوەری لە ڕۆمانی **نەتەوەی زێرابەکان دا**

**پشتیوان هەڵەبجەیی**

ڕۆمانی نەتەوەی زێرابەکان ڕۆمانێکی قەبارە بچووکە و لە دووتوێی (**240**) لاپەڕەی (**A4**)دا لە ڕۆژی ٢٠١٣/١/٤ ناوەندی ئەندێشە چاپ و بڵاوی کردووەتەوە. ئەم ڕۆمانە دەچێتە خانەی ڕیالیزمی جاویدانییەوە و لەبری ئەوەی ئەفسانە بکات بە واقیع، واقیعی کردووە بە ئەفسانە. بە زمانێکی جاویدانی و ئەدەبی داڕێژراوە و ڕۆمانێکی جوانە و بە شێوەیەکی ئەدەبی و جوان داڕێژراوە و بە شێوەیەکی نائاگایانە خوێنەر بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێت. دەکرێت بڵێین خەتی گشتیی ئەم ڕۆمانە قسەکردنە لەسەر زۆر بابەت و چەمکی ژیان، بەڵام زۆرترین کار لەبارەی کولتووری چەقبەستوو و ئاسەوارەکانی جەنگ و مەرگی بەختەوەرییەوە کراوە. نووسەر لەم دەقەدا زۆرترین کاری لەسەر ئاسەوارە خراپەکانی جەنگ کردووە و کۆی دەقەکەی تەرخان کردووە بە گەڕانێك بە دوای ماناکانی بەختەوەریدا، کە دواجار نووسەر دەگاتە ئەوەی کە لەسەر بەختەوەریی ناو زێرابەکانی نیشتیمان دەدوێت. کارەکتەری سەرەکیی ئەم ڕۆمانە منداڵێکی گچکەیە، کە مانا و چەمکی بەختەوەری لە ناو خێزانەکەیدا ون دەکات. ئەمەش کاتێك ڕوو دەدات،



که باوکی ژنی دووەم دەهێنێت و دایکی لە ئازاردا توانای خۆڕاگریی نامێنێت و هەڵدێت و دواتر لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا لە ناو تەنووری نانەواخانەیەکدا دەسووتێت. ئیدی لەو ڕۆژەوەی کە باوکی ژنی دووەم دێنێت و دایکی دەسووتێت، ئەم بە دوای بەختەوەریدا وێڵ دەبێت.

کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانەکە بە دوای بەختەوەریی ڕەهادا دەڕوات و ئیدی لەوێوە دەقەکە درێژ دەبێتەوە. کارەکتەر دەیان کار تاقی دەکاتەوە، مودەتێك لای فیتەرەکانی شار شاگری و بەردەستی دەکات و خۆی دەدات بە دەست ڕەشی و چڵکوچەوریی پارچەی ئۆتۆمبیلەکانەوە. دواتر تا دێت غەمگینتر دەبێت. پاشان ئیشی دەکەوێتە لای شۆفێری بارهەڵگرەکان و لەگەڵ ئەوان سەرەتایەکی نوێ لە ژیانیدا سەرهەڵدەدات و بۆ یەکەمین جار سنوورەکانی شارەکان دەبڕێت و لەگەڵ شۆفێر و بارهەڵگرەکان ڕێگە بێکۆتاییەکان دەبڕێت و هەرگیز هیلاك نابێت لە ڕێگەکاندا و شۆفێرەکان لە ناو خۆیاندا دەستاودەستی پێدەکەن و هەر ماوەیەك لای شۆفێرێك دەبێت و هەر شۆفێرێك کۆتایی بە کارەکەی دێنێت یان پەکی دەکەوێت یان تووشی ڕووداو دەبێت، ئەم تەسلیمی شۆفێرێکی هاوڕێی دەکات، ئەم کێشەی نابێت، گرنگ ئەوەیە لە پێشی بارهەڵگرەکانەوە دانیشێت و لە ڕێگە نەبڕاوەکان بڕوانێت، هەموو هەنگاوێك و ڕێگەیەك لای ئەو چێژبەخش و تازەن .

بەڵام جارێك لای بارهەڵگرێکی شکاو لە گوزەری فیتەرەکان بەجێ دەمێنێت و لە دوای چاوەڕوانییەکی زۆر خاوەنی بارهەڵگر پەیدا نابێتەوە و ئەمیش لە چاوەڕوانی بێزار دەبێت و عەرەبانەی بارهەڵگرەکە دەکات بە ماڵی خۆی. پاشان بە هۆی ڕووداوێکی سەیرەوە کە ژنێکی سفوری تیا دەکوژرێت، هەموو شتێك گۆڕانی بەسەردا دێت. بە تەکنیکێکی جوان لە ئەنجامی ئەو ڕووداوی کوشتنە، کە دواجار ڕووداوی ڕشتنی خوێنێك ڕێڕەوی ڕۆمانەکە دەگۆڕێت و کارەکتەری سەرەکی لەگەڵ خێڵی تارماییەکان بەرەو ڕۆخی زێرابەکان بەڕێ دەکەون بەو ئومێدەی لە ناو زێرابەکاندا بەختەوەری بوونی هەبێت، ئەوان بۆ شوێنێك دەچن، کە دەستی مرۆڤی نەگاتێ و یاسای مرۆڤ حوکمی نەکات، بە دوای بەختەوەرییەکەوەن، دوور دوور بێت لە دەستی مرۆڤەکان، دواجار دەگەنە ڕۆخی زێرابەکان و وەك کرم بەسەر پاشماوەی زێرابەکانەوە دەژین.

نووسەر لێرەدا دەیەوێت حەقیقەتێکی تاڵ دەستنیشان بکات. ئەگەر باس لە فەلسەفەی پشتی ئەم دەقە بکەین، دەتوانین بڵێین نووسەر دەیەوێت بە ناڕاستەوخۆ پێمان بڵێت ژیان بووە بە زێرابێکی گەورە و بەختەوەری جگە لە ناو گواو، هیچ مانایەکی تری نییە؛ دەیەوێت پێمان بڵێت کێ دەستی لە ناو زۆرترین گوودا بێت، زۆرترین بەختەوەری دەدۆزێتەوە. بەختەوەریی ڕاستەقینە لای نووسەری ئەم ڕۆمانە نوقمبوونە لە ناو تاڤگەی گوودا، لە ناو هاڵاوی زێرابەکاندا، ئەو دەیەوێت ئەو حەقیقەتەمان بۆ ئاشکرا بکات، کە ژیانی ئێمە پڕە لە زێراب، پڕە لە گوو، پڕە لە پیسی و ئێمەش مەحکومین بە گەڕان لە ناو زێرابەکاندا و خودی ژیان سووڕانەوەیەکی بێتامە لە ناو کۆمەڵێك زێرابی یەك لە دوای یەکی بۆگەندا. نووسەر ژیانی ئەم وڵاتەی بە کۆمەڵێك زێراب شوبهاندووە و پێمان دەڵێت هەستکردن بە بەختەوەری وەك ئەوە وایە لە ناو گوودا هەست بە دڵخۆشی بکەیت. پێمان دەڵێت غەرقبوون لە ناو گوودا باشترە لە غەرقبوون لە ناو خوێندا.

نەتەوەی زێرابەکان تەوزیف و ڕاڤەی  ژیانی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتییە، ژیانی هەموو ئەو نەتەوانەیە، کە سیاسەت و سەروەت و سامانی وڵاتەکانیان وێرانی کردوون و جەنگ ناهێڵێت چاو بکەنەوە و هەناسەیەك هەڵمژن، ژیانی هەموو ئەو نەتەوانەیە، کە سیاسەت و کولتوور و ئایین و یاساکانی خێڵ و دابونەریت دەستی ناوەتە بینەقاقایان و ناهێڵێت کەس وەك خۆی بیر بکاتەوە و جۆگەلەی خوێن بە شارەکاندا ڕاکێشراوە و مەرگ لە هەناسەی هەموان نزیك بووەتەوە. نووسەر پێمان دەڵێت هەوڵی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی بۆ ئازادی و بەختەوەری تەنها و تەنها سووڕانەوەیەکی بێهودە و بێتامە لە ناو کۆمەڵێك زێرابی گەورەدا، کە ئەمسەر و ئەوسەری نییە.

نووسەر لە زاری کارەکتەری یەکەمەوە پێمان دەڵێت: (ئازادیی ڕاستەقینە بەرەو ڕوومان دەهات. دیتمان، خودی ئازادیمان دیت، دوای سەربەستی کەوتین، سەربەستیی ڕاستەقینە لێرە لە قووڵایی زێرابەکان لە ناو گواودایە). ئەو کە دەڵێت سەربەستیی ڕاستەقینە (لێرە)، مەبەستی لەم وڵاتە و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتە، کە ژیانیان هێندە نابووت بووە، ئازادی و سەربەستی چووەتە ناو پیساییەوە. مرۆڤ بۆ ئەوەی دەستی بە ئازادی و سەربەستی بگات، دەبێت بچێتە ناو زێرابەکانەوە بۆی، دەشێت مەبەستی نووسەر لەوە بێت کە ئازادی و بەختەوەری





لەسەر زەمینەکەی ئەودا مەحاڵە.

بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە نووسەر دەیەوێت گەشبینانە بدوێت و ئومێد بە خوێنەرەکان ببەخشێت، ئەیەوێت بڵێت مەرج نییە جەنگ لە هەرکوێ هەبوو، ئیدی بەختەوەری بوونی نەبێت. ئەو دان بەوەدا دەنێت کە ئازادی لە وڵاتی جەنگ و ئاگردا مەحاڵە، بەڵام بەختەوەری ون نابێت، مرۆڤ دەتوانێت هەست بە بەختەوەری بکات، ئەو دەیەوێت پێمان بڵێت کە بە دوای بەختەوەرییەوە بین و دەستبەرداری بەختەوەری نەبین و کۆڵ نەدەین لە گەیشتن بە بەختەوەری.

نووسەر دەیەوێت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێمان بڵێت گرنگ نییە ئێمە کێین، سەر بە کوێین، خەڵکی کوێین، لە چ نەتەوە و ئایین و کولتوورێکین، گرنگ نییە لە کوێداین، تەنانەت ئەگەر لە ناو زێرابەکانیشدا بووین، گرنگە بە دوای بەختەوەریدا بڕۆین و دەستبەرداری خەونەکانمان نەبین، هەست بە بەختەوەری بکەین و چێژ لە خۆشییەکان وەربگرین، نووسەر بە ڕوونی پێمان دەڵێت: ئێوەی سەرزەمینی وڵاتە خاپوورەکان، وڵاتانی جەنگ و جەللاد، لە زێرابی وڵاتە داڕووخاوەکاندا گیرتان خواردووە و ئیدی دەربازبوونتان بۆ نییە و جەنگ و جەنگاوەر و جەلاد و سیاسەت مەملەکەتەکەی لێکردوون بە زێرابخانەیەکی گەورە. بۆ خۆشاردنەوە لە ناشیرینییەکان دەبێت غەرقی گواوەکان بن و خۆتان لەگەڵ زێرابەکان ڕابێنن.

لە لاپەڕە (**89**)ی ڕۆمانەکەدا دەڵێت (پێش ئەوەی دونیا ڕوون بێتەوە، لە مەیدانی ئیمام حەفیدا تێکەڵ بە یەکتر بووین، لەشکری گەورەی تارمایی سەرزەمینی بەجێ هێشت، بە هەمان ماتیی خۆڵەوە چووینە ناو گەورەترین زێرابی ئەو شارە). ئەو شارە بەغدادی شوێنی سەقافەت و پێشکەوتن و زانست و زانیارییە، ئەوێ کوچەیەکی ئەو شارەیە و تارمایی بە کۆدی مرۆڤە غەمگینەکان هاتووە. نووسەر هەموو مرۆڤە غەمگین و ڕۆحە سەرلێشێواوەکانی لە شێوەی تارماییدا کۆ کردووەتەوە و گەورەترین لەشکری لێ پێك هێناون و دەیەوێت بیانبات بۆ شوێنێکی ئارام، بۆ شوێنێك کە دەستی سیاسەت و جەنگاوەرەکانی نەگاتێ، بەڵام ئەو شوێنە گەورەترین زێرابەکانی پایتەختە، ئەو پێمان دەڵێت بۆ خۆشاردنەوە لە جەنگ و نابوتییەکان باشترین شوێن ناو زێرابەکانە؛ پێمان دەڵێت کە لە ئێستادا ناو گواوەکان لە سەرزەمین جوانترە، دەشێت ئەمە بەشێك لە تووڕەیی نووسەر بێت لە سیاسەت

و ئاسەوارەکانی جەنگ.

نووسەر لە ناو زێرابەکاندا دەوڵەتێك بۆ لەشکری تارماییەکان دروست دەکات، دەوڵەتێکی بێسنوور، بێ پاسپۆرت، بێ بازگە و سەرباز و دەسەڵات، دەوڵەتێکی گەورەی بێچەك، لەوێ بۆ سەفەرکردن لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دی، پێویستت بە هیچ نابێت و هیچ سنوور و یاسایەك هاووڵاتیانی نەتەوەی زێرابەکان نابەستێتەوە بەیەکەوە، لەوێ کەس پێناسی لە گیرفاندا نییە، کەس خاوەنی ئایین نییە، کەس بیر لە خودا ناکاتەوە، داب و نەریت و کولتوور و ئەو شتانە بوونیان نییە، ڕووتی و ڕووتبوونەوە و لەشی ژنەکان هیچ کارەساتێك ناخوڵقێنن. دەکرێت بگوترێت لەوێ لە سەرەتادا جۆرێکی ڕەها لە بەختەوەری بوونی هەیە و نووسەر توانیویەتی سەرزەمینێکی جیاواز بۆ نەتەوەی زێرابەکان بخوڵقێنێت.

بەڵام لە بەشێکی دیکەی ڕۆمانەکەدا باس لە دروستکردنی پادشاکان دەکات، کە گەنجە تارماییەکان لە ئێسکوپروسکی تەرمی ناو زێرابەکان پەیکەرێك لە شێوەی پادشا دروست دەکەن و لە هەمان ئێسکوپروسك پاسەوانی بۆ دروست دەکەن و دواجار گومانی ئەوە دەکەن کە وەئاگا بێت و یاسا و ڕێسا بۆ نەتەوەی زێرابەکان دابنێت، نووسەر لە زمانی کارەکتەرێکەوە دەڵێت: (خۆ ناکرێت چاوەڕێ بم ئەو پادشا فرەئێسقانە وەئاگا بێت. ئاخر ئێسقانەکانی ئەویش هی مرۆڤە باڵاکانن، وەئاگا بێت و لەسەر ئەو قەڵاتەوە بەسەر بەردەست و پاسەوان و چەکدارەکانیدا هاوار بکات و تارماییەکان پان بکاتەوە، چونکە ئەو تارماییانەی دروستیان کردووە، شمشێریان بە کەمەریەوە کردووە، دەمانچەیان خستووەتە لاقەدی، تفەنگیان بە ملی پاسەوانەکانیدا هەڵواسیوە).

لێرەدا نووسەر لە چۆنیەتیی دروستکردنی دیکتاتۆر دەدوێت؛ دەیەوێت پێمان بڵێت میللەت خۆی دیکتاتۆر دروست دەکات، جاهیلیەتی میللەت وا دەکات دیکتاتۆر و زاڵم دروست بن، چەپڵەکان و یارییەکانی ئێمە وا دەکەن پادشا و دیکتاتۆر دروست بێت. خۆمان پادشاکان بەهێز دەکەین و شمشێر بە لاقەدیاندا هەڵدەواسین و دەچین وەك کۆیلە خۆمانی پێشکەش دەکەین و سوپای بۆ دروست دەکەین و دەبینە سەرلەشکری جەنگەکانی و دواجار وەك ئاگرێك کە خۆمان دروستمان کردووە، خۆمان دەسوتێنێت. نووسەر دەیەوێت حەقیقەتێك بڵێت، دەیەوێت



ئەو خاڵە ڕۆشن بکاتەوە، کە ئێمە زۆرجار وەك يارييەكی منالآنە پادشايەك دروست دەكەين، كەسێك دەكەين بە سەرۆك، كەچی دواجار ئەو مەترسيدارترين ياری  بە ئێمەوە دەكات و دەبينەوە بە قوربانيی يارييەكانی سەرۆك، ئەو سەرۆكەی كە لە يارييەكانی خۆمان دروست بوو.

ڕۆماننووس لە بەشێكی ديكەی ڕۆمانەكەيدا لە حەقيقەتێكی تاڵ دەدوێت و پێمان دەڵێت:

لەم مەملەكەتەدا بەختەوەری و ئاسوودەيی لە هيچ كوێ بوونيان نييە، دەيەوێت بڵێت تەنانەت بە ناو زێرابەكانيش ڕازی دەبين بە مەرجێ ئاراميمان دەست بكەوێت و لە جەنگ و بۆنی خوێن و مەرگ ڕزگارمان بێت، بەڵام جەنگ دەست ئەخاتە ناو زێرابەكانيشەوە و دەرفەت بۆ جرج و مشكەكانيش ناهێڵێتەوە، كە بە ئاسوودەيی پشوو بدەن، ئەمە بەشێكی تری نائوميدييەكانی نووسەرە لەمەڕ دۆخی جەنگ لەم وڵاتەدا. ئەو لەوە دەدوێت كە بە هۆی جەنگ و زۆريی تەرم و كوشتنەكانەوە، بە هۆی لافاوی خوێنی مرۆڤەكانەوە ڕەنگ و بۆن و ئاراميی زێرابەكانيش دەشێوێت و لە كۆتاييدا مشكەكانيش ئاگاداری ئەوە دەبن، كە لە سەرزەمين تەنها كوشتن هەيە و هيچی دی، دواجار تەرمی پارچەپارچەكراو لە ڕێی زێرابەكانەوە دەگات بە لەشكری تارمايييەكان و ئاراميييەكەيان لێ تێك دەچێت .

دواجار نووسەر باس لەوە دەكات، كە لەم مەملەكەتەدا بستێك ئارامی نە لەسەر زەوی نە لەژێر زەوی چنگ ناكەوێت. لە كۆتايی ڕۆمانەكەدا لەشكری تارمايی ناچار دەكرێن زێرابەكان جێ بهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ سەرزەوی. كەواتە ئەگەر ئەم ڕۆمانە بەيەك دێڕ پێناسە بكەين، دەڵێين (جەنگ ڕووی لە هەر مەملەكەتێك كرد، ئارامی لەوێ دەتۆرێت و مەرگی بەختەوەری بە چاوی خۆمان دەبينين و ئاسەوارەكانی جەنگ جوانييەكان لەناو دەبەن).

# عەلی ئەشرەف دەروێشیان

**سازکردن و وەرگێڕانی: بابەک سەحرانەوەرد/ تاران**

عەلی ئەشرەف دەروێشیان، ڕۆماننووس و ڕووناکبیری هاوچەرخ، ساڵی **1941** لە شاری کرماشان لە خێزانێکی کورد لەدایك بووە. لە سەرەتای پەنجاکانەوە بە نووسینی چەند کۆمەڵەچیرۆکێك، وەك (لەم گوندەوە، ئابشووران)، هاتووەتە نێو دونیای ئافراندن و ئێستاکە یەکێکە لە ڕووە گەشەکانی جیهانی چیرۆك و ڕۆمانی فارسی. بەناوبانگترین بەرهەمی دەروێشیان ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری)یە، کە لە سەردەمی خۆیدا بایەخی فرەزۆری پێدرا و وتار و ڕەخنەگەلی زۆریشی بۆ تەرخان کرا. هەرچەندە ئەم ڕووناکبیرە بە ڕەچەڵەك کوردە، بەڵام تەواوی بەرهەمەکانی بە فارسی نووسیوە و لە واقیعدا بە نووسەرێکی فارسزمان ناسراوە. تەنها کتێبێك کە لەمەڕ ئەدەبی کوردی لە ئێران چاپی کردووە،

کۆمەڵەچیرۆکی نووسەرانی کوردستانی باشوورە، کە چەند ساڵ لەمەوبەر لە لایەن دەزگای بەناوبانگی (چشمە) بڵاو کرایەوە.
ناوبراو لەم گفتوگۆیەدا پتر لەمەڕ ڕوانگە و هەڵوێستە تاکەکەسییەکانی خۆی لە بواری نووسین و پرۆسەی داهێنان و بارودۆخ و ئاستەنگەکانی ڕۆشبیریی لە جیهانی مۆدێرندا بە زمانێکی خۆمانە دەپەیڤێت.

بابەك: مامۆستای بەڕێز، سەرەڕای سپاس لە ئێوە بۆ ئەم دیمانەیە، وا باشترە ئەم گوتوبێژە بە چەند پرسیاری نائاسایی دەست پێبکەین تا بگەینە پرسیارە سەرەکی و گرینگەکان. ئاخۆ هەر لە منداڵییەوە پێتان خۆش بوو ببن بە نووسەر؟
عەلی ئەشرەف: نا، ئەو کاتە قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە ڕۆژێ دێ و دەبمە نووسەر. لەبەر ئەوەیە کە ڕەنگە نووسەری وەك هەر شتێکی دیکە تەنها یەك پێشهات بووبێت. بڕوانە، من لە خێزانێکدا پەروەردە بووم و ژیانم بردووەتە سەر، کە هەر لە ڕۆمانی چواربەرگیی (ساڵیانی هەوری)دا وەسفم کردووە. خێزانی من خێزانێکی کرێکار و ڕەنجدەر بوون، چونکە لەم خێزانە من کوڕەگەورەی ماڵەوە بووم، بۆ قوتابخانە ناردویانم. ئەو دۆخە بە جۆرێ بووە، کە نەمتوانی درێژە بە خوێندەواریم بدەم. بە ناچار هاریکاری باوکم بووم، بەڵام لەولایشەوە حەزی زۆرم لە خوێندن بوو.

بابەك: مامۆستا، هۆکاری نووسەربوونت چی بوو؟
عەلی ئەشرەف: ڕووداوەکانی چاخی سەرۆکوەزیران واتە (دکتۆر موسەدیق) و ئەو شەوقوزەوقە کە خوێندن بە گوڕوتینەوە لە مندا ڕیشەوڕەگەزی چەقاندبوو، لە واقیعدا هانی دەدام شوێن ئەم شتانە بکەوم. لە حاڵێکدا کە من تەنیا **13ـ12** ساڵم زێتر تێنەپەڕاندبوو و لە لایەکی ترەوە لالۆیەکم بوو، کە کارمەندی بەشدارگەی نەوت بوو، لەو چاخەدا لە ئەندامانی سەر بە پارتی توودە بوو و چاپەمەنییەکانی ئەو حیزبەی بۆ دەهێنام و منیش بە تامەزرۆییەوە دەمخوێندنەوە، بە جۆرێ، کە دواتر تاسەی من لە لالۆکەم زێتر بوو و دەچووم و هەموو بڵاڤۆکەکانی ئەو چاخەم دەکڕی و ئەمخوێندنەوە. کتێبگەلی زۆرم دەخوێند و بەرلەمەش لە ماڵی





ئێمە کتێبێك وەك (ئەمیر ئەرسەلانی ناودار) دەخوێندرایەوە یا باوکم شێعری ئەوت، کە من بۆم ئەنووسی. تەواوی ئەم ڕووداوانە منیان بە لای خۆیان بە مەبەستی نووسین و خوێندنەوە هەڵدەخراند. بەڵام چ کاتێ ئامانجم نەبوو ببمە نووسەر. تەنیا کاتێ ڕووم هێنایە نووسین، کە قوتابیی دواناوەندی لە پۆلی سێهەم بووم و ڕۆژنامەی دیواریمان دروست دەکرد. ئەم کارە بووە هۆی ئەوە کە خۆم هێڵکاری و نووسینی تێکستەکانی ڕۆژنامەکە بگرمە ئەستۆ. دواتر تەنانەت بە یارمەتیی هاوڕێکانم گۆڤارێکمان دەرکرد. واتە گۆڤارێك کە دەکرا بیدەینە دەست هاوڕێکانی دیکەمان بە مەبەستی خوێندنەوە. لەسەر ڕووبەرگی هەوەڵین ژمارەی ئەو گۆڤارەدا وێنەی (ئەمیر کەبیر)مان نەخشاندبوو و هەروا کە ئاماژەم پێدا، خۆم گشت کارەکانم لە ئەستۆ گرتبوو. ئەم گۆڤارە لە نێوان قوتابیان دەست بە دەست دەگەڕا و دەخوێندرایەوە. دواتر هەر لەو تافەدا دەستم کرد بە نووسینی ڕۆمانێك، کە یەکەم بەشی لە سێ چوار لاپەڕەدا نووسیبووم و دواتر هاوڕێکانم دەیانگوت: دواییيەکەی بوو بە چی؟

بابەك: لە ئەنجامدا هەوەڵین بەرهەمی خۆتان لە چ تەمەنێك و لە کوێدا چاپ کردووە؟

عەلی ئەشرەف: من بۆ چاپی بەرهەمەکانم هەر خۆم دەپاراست، دەمگوت دەبێ کاتێ بەرهەمێك لە قەوارەی کتێبدا ئاراستەی خوێنەر بکەم، کە بە کەڵکی خوێندنەوە بێت. لە حاڵێکدا کە نووسراوەی زۆریشم بە دەست بوو، بەڵام لە بڵاوکردنەوەیان خۆم زۆر دەپاراست. هەوەڵین بەرهەمم بە شێوەیەکی جیدی لە بەندیخانەی کرماشان نووسیوە. واتە هەر ئەو کاتەی کە لە پرسینەوە و ئیفادەکان ڕزگار بووم و ڕەوانەی بەندیخانە کرام، کاغەز و پێنووسیان پێداین و قۆڵم هەڵماڵی بۆ نووسینی چیرۆکی (ئێران)، کە هەر چیرۆکی (نییەتی) بوو، کە وەك دوایین ئەزموونی من لەو هەڕەتەدا دەهاتە ئەژمار و تازە ببوومە مامۆستای قوتابیان. هەڵبەت مەسەلەیەك لەسەر من لە بۆ مامۆستابوونم هەرە کاریگەر بوو، ئەوەش خوێندنی زنجیرە

تێکستێك بە سەردێڕی (یاداشەکانی مامۆستایەك) بە پێنووسی (محەمەد عاسمی) بوو و لە گۆڤاری (ئۆمیدی ئێران)ی ئەو سەردەمە چاپ دەبوو. ئەم زنجیرە تێکستە ڕۆڵێکی کارای لەسەر من هەبوو تا ببم بە مامۆستا. ئەو تێکستە لێشاوی چەرمەسەری و مەینەتییەکانی مامۆستایەکی دەخستە بەرچاوم، مامۆستایەك کە بە هۆی هەژارییەوە، لە وەرزی هاوین ناچارەکی مێوەی دەفرۆشت. بەڵام بە تەواوی ئەو کێشە و ئاستەنگانە، تامەزرۆیی و حەزێکی زۆرم لە مامۆستایی بوو. لە حاڵێکدا کە مامۆستایی و ڕۆیشتن بەرەو گوندەکان زۆر یارمەتیدەرم بوو تا ڕوانگەیەکی نوێ بۆ ژیان دابین بکەم و لە نزیکەوە لەگەڵ مەینەتی و هەژاریی خەڵکانی وڵاتەکەم ئاشنا ببم. ئەوە بوو لە ساڵی **50**ی هەتاوی کاتێ کە دەستبەسەر و لە ئەنجامدا بەندی بووم، زۆربەی چیرۆکەکانی کۆمەڵەچیرۆکی (لەم گوندەوە)م لە زەینمدا داڕشت. چونکە نەمتوانی ئەو تێکستانە لەوێ بێنمە دەرێ. بۆیە هەر ئەو کاتەی ڕزگار بووم، تەواوم ڕشتە سەر ڕووپەلی کاغەز و هەوەڵین چیرۆکێك کە لە چاپم دا، ناوی (باخچە چکۆلەکەی ئێمە) بوو کە لە گۆڤاری (فردۆسی)ی ئەو چاخە بڵاو کرایەوە.

بابەك: مامۆستا، دەتوانم لێتان بپرسم کە نووسەرە خۆشەویستەکانی ئێوە کێن؟

عەلی ئەشرەف: من وای بۆ دەچم بە درێژایی ژیانی مرۆڤ نووسەرە خۆشەویستەکانی هەر کەسێك ئەگۆڕێ. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە ئێمە چیمان لە نووسەران ئەوێ و چۆنچۆنی بەرسڤی هیوا و خولیاکانمان ئەدەنەوە. ئەگەر چۆنیەتیی سەرەتای ڕەوتی نووسینم بۆ ئێوە بخەمە ڕوو، پێتان سەیر دەبێت. من پتر ئەو بنووسانە کە چیرۆکی ئاساییان دەنووسی و بە نووسەرانی (پاوەرەقینووس)  یاخود بە (پەراوێزی) ناسراو بوون، بە نووسەرە خۆشەویستەکانی خۆمم دەزانی، چونکە لەو تافەدا کە **13** ساڵانە بووم، کاتێ گۆڤارەکانم دەخوێندەوە، بە زۆری حەزم لەو جۆرە ئەدەبە ئەکرد، بۆ نموونە، لە هەرەتی جەحێڵیدا بەرهەمەکانی (ئیبراهیم مودەڕەسی)م دەخوێندەوە، کە دەقەکانی لە گۆڤاری (تەرەقی) چاپ دەبوون. ئەمە سەرەتای چێژ و لەززەتە ئەدەبییەکانی من بوون، بەڵام هەروا کە گەورەتر ئەبووم و بەرەبەرە خوێندەوارییەکەم پەرەی دەسەند، لەززەتم لە بەرهەمەکانی هەندێ نووسەری دیکەش ئەبرد هەتا گەیشتمە خوێندنی بەرهەمەکانی (سادق



هیدایەت). شایانی باسە هەوەڵین دەقێ کە لەم نووسەرەم خوێندەوە، چیرۆکێك بوو کە داپیرەم بۆی گێڕابوومەوە. داپیرەم لەسەر نیگا و ڕوانینم بۆ چیرۆك زۆر کارتێکەر بوو. هەم لە بواری چیرۆکبێژی و هەم لە دەڤەری چیرۆکخوێندن. ئەو چیرۆکەش کە ئاماژەم پێدا، ناوی (داوای لێبوردن) بوو. وێدەچێ چ کاتێ نەبوو ئەم پرسە ئاڕاستەی داپیرم بکەم کە ئاخۆ ئەم چیرۆکەی لە کەسێ بیستووە یا کەسێك بۆی خوێندووەتەوە یان هەر چیرۆکی ڕەمەکی و عەوامانە بووە، کە لەو چاخەدا سەرزاری خەڵکی کەوتووە. بەر لەمە، چیرۆك بۆ من ببووە هەرامەیەکی هەرە سەیروسەمەرە. وردەوردە لە کاتێکی دیکەدا چاوم کەوتە سەر بەرهەمەکانی (سادق چووبەك) و لێی ورد بوومەوە. کە گەورەتر بووم، ئاوڕم لە بەرهەمەکانی (ئەحمەد مەحمود)، کە ئێستاکەش چێژێکی زۆر لە بەرهەمەکانی ئەبەم، دایەوە. دواییش خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەرە بیانییەکانم لە ڕێچکەی وەرگێڕانەوە دەست پێکرد. لەم نێوانەدا (ماکسیم گورکی)م زۆر بەدڵ بوو و زۆریشم تاسە ئەکرد. چونکە بە ژیانی من و ئەو بارودۆخەی کە تێیدا ئەژیام، نزیکایەتییەکی هەرە سەیری بوو. بەم هۆیە، بەرهەمێن (گورکی)م پەسەند دەکرد و دوای ئەویش گەیشتمە خوێندنی بەرهەمێن (شۆڵۆخۆف)، کە (دۆنی ئارام)م چەنها جار خوێندووەتەوە، هەروەتر ڕۆمانی (شەڕ و ئاشتی)ی تۆڵستۆی و چەنها ڕۆمانی دیکەش.

بابەك: ئەمڕۆکە و لەم تەمەنەدا بەرهەمی کام نووسەرانت بەدڵە و کام بەرهەمیان دەخوێنیتەوە؟

عەلی ئەشرەف: ئیمڕۆکە ئەگەر بمەوێ پێڕستێك لە نووسەرە دڵخوازەکانم بە دەستەوە بدەم، دەبێتە پێڕستێکی هەرە درێژ، کە ڕەنگە کەسانێ جێ بهێڵم و پێم جوان نییە ئەم شتە ڕوو بدات.

بابەك: لەم پرسیارانەوە بە نووسەرە ناوخۆییەکان واتە (ئێرانییەکان) دەگەین. مەبەستم لە پرسیاری پێشوو، بەرهەمی نووسەرە بیانییەکانە.

عەلی ئەشرەف: ئیستاکە بەرهەمەکانی (مارکێز)م فرە خۆش ئەوێ و هەروا ڕۆمانەکانی (تۆنی مۆریسۆن)، (یۆسا) و ... هتد. هەڵبەت (میلان کۆندێرا)ش دەخوێنمەوە، بەڵام لەمەڕ بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە هەڵوەستەیەکی تایبەتیم هەیە، کە لە دەرفەتێکی دی ئاڕاستەی دەکەم.

بابەك: وا دەزانن باشترین ڕەخنەیەك کە بۆ بەرهەمەکانی ئێوە تەرخان بووە، کام ڕەخنەیە و تا چ ڕادەیەك بەدڵتان بووە و پێی قایل بوون؟

عەلی ئەشرەف: لە ڕاستیدا بەرهەمەکانم کاتێکی درێژخایەن بە بێدەنگی بەرامبەر بوون. ڕەنگە بۆ بەرهەمەکانی من چ بایەخ و گرینگایەتییان تەرخان نەکردبوو تا بێن و ڕەخنەیەکی ئاڕاستە بکەن. بەڵام دواتر بیستم کە هەر لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینی **57**، چەند کەس بۆ کۆمەڵەچیرۆکی (لەم گوندەوە) ڕەخنەیان نووسیبوو، بەڵام ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە چاپیان نەکردبوو. دوای ڕاپەڕین لەملاولا لەمەڕ بەرهەمەکانم شتیان دەنووسی و باشترین ڕەخنەیەك کە خۆم خوێندوومەتەوە و بەدڵیشم بووە، ڕەخنەی ڕێزدار (حەسەن فەڕوخ سرێشت)بوو، کە لەمەڕ کۆی بەرهەمەکانم ئاڕاستەی کردبوو و لە گۆڤاری (فەرهەنگی تەوسەعە) چاپ بوو.

بابەك: لە کاتی نووسیندا ئاوڕت لە چ شتگەلێك ئەدایەوە، پتر لە هەر شتێکی دی؟

عەلی ئەشرەف: لەو شتانەی کە پتر ئیشم پێیان بوو و بەردەوام لە داڵغەمدا لە هاتوچۆدا بوون. بە ژان و کوێرەوەریی خەڵکی عەوام، بەو هەمووە زوڵمە کە لێیان دەکرێ. زۆر بیر لە بەتاڵبوونی ژیانیان دەکەمەوە. ئاوڕ لە تەواوی ئەم شتانە ئەدەمەوە و زۆریش لێیان ڕادەمێنم.



بابەك: ئاخۆ بیروباوەڕتان بە شتێك بە ناوی (ئیلهام) هەیە؟

عەلی ئەشرەف: نا، هەتا ئێستا شتێك بە من ئیلهام نەبووە.

بابەك: ئایا بەر لە نووسینی ڕۆمانێك، پێشتر گەڵاڵەی ئەو ڕۆمانە لە زەینی خۆتاندا دائەڕێژن؟



عەلی ئەشرەف: نووسەر هەندێ جار وێنەگەلێکی فرەزۆری لە زەیندایە. ئەمن ئێستا لە ژوورەکەم دەچمە دەرێ، ڕەنگە ئەم دیمەنە بێتە بەرچاوم کە دایکێك دەستی منداڵەکەی گرتووە و چاوەڕێی پاسە یان وای دابنێ، دایکێ کە منداڵەکەی بە دزییەوە لە سەوەتەی میوەفرۆش میوە هەڵدەگرێ و دوور لە چاوی دایکی دەیخوات. زۆر جار لەم وێنەگەلە ورد دەبمەوە و هەمیشە لە زەینمدا جێ خۆش دەکەن. دوای ئەمە، کاتێ دەمەوێ چیرۆکێك بنووسم، لە زۆر جێگەی دەقەکانم کەڵك لەم وێنەگەلە وەردەگرم. واتە دەتوانم بە ئاوێتەکاری و چێکردنی ئەم وێنەگەلە لە ڕێی ئەو ئامانج و بیروبڕوایەم زۆر شت بێنمە سەر ڕووپەلی کاغەز. بەم شێوە زۆربەی وێنەگەلی ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری)م لە بەندیخانەی (قەسروئەوین) نووسیوە. لە بیرمە لە کاتی خوێندنی ڕۆمانی (گیانی شیفتە)ی ڕۆمەن ڕۆلاَن یەکێك لە هاوڕێکان پێی وتم ئاخۆ تا ئێستا هەوڵت داوە ڕۆمانێ بنووسی؟ منیش هەر زوو قۆڵم هەڵماڵی بۆ نووسینی ڕۆمان و هەستم ئەکرد دەتوانم بەرهەمێ بەو شێوەیە بنووسم، کە هاوشێوەی ژیانی خۆم بێت. لە تەنیاییدا بیرم دەکردەوە و وردەوردە وێنەگەلێك لە بەرچاوم گیانیان دەگرت، وەك کەسێتیی و هەندێ شتی دی. ئەوە بوو کاتێك لە زیندان ڕزگار بووم، دەستم بە نووسین کرد. یاداشتی زۆرم هەڵگرت و هەموویانم کۆ کردنەوە. وێنەگەلێکی زۆرم بە دەستەوە بوون. قسەگەلێکی زۆرم لە جەماوەری عەوام کۆ کردبوونەوە و زۆرشتی دیکەش لە زەینمدا بوون، کە هەر لە هاتوچۆدا بوون.

بابەك: ڕێزدار دەروێشیان، ئاخۆ لە کاتی نووسیندا، بایەخ بە خوێنەر و بەردەنگیش ئەدەن؟

عەلی ئەشرەف: بەڵێ، لە بنەڕەتەوە یەکێك لەو پرسە سەرەکییانە کە منی بە لای خۆیەوە هەڵخراندووە و منیش زۆری لێ ورد بوومەوە و بۆم بووەتە مەسەلەیەکی هەرە جیددی و دیار، مەسەلەی خوێنەرە. لە ڕاستیدا باوەڕم بەوە نییە ئێستا بێم شتێ بنووسم، کە سەد ساڵ

یاخود دووسەد ساڵی تر بێن و بەرهەمەکانم بخوێننەوە و بڵێن بڕوانن، ئەم بنووسە چ شاکارێکی داهێناوە. هەر لە بنەڕەتەوە ئیمانم بەم قسە پووچ و بێکەڵکانە نەبووە. لەبەر ئەوەی کە من بۆ سەردەمی خۆم دەنووسم و زۆریش داخوازم کە ژان و مەینەتی و کێشەکانی ئەم چاخە بگێڕمەوە و ئاوڕێکی تەواوەتییان لێبدەمەوە. مەگین زۆر نووسەرمان ئا بەم شێوەیە نەبووە. سادق هیدایەت مەگین بۆ ڕۆژگاری خۆی نەینووسیوە.

بابەک: بە بڕوای خۆتان، کام کتێب لە پرۆسێسی نووسەریتان لەسەر ئێوە کارلێکەر بووە؟
عەلی ئەشرەف: لەمەڕ نووسەربوونی خۆم دەبێ بڵێم کتێبە وەرگێڕدراوەکانی سەر زمانی فارسی و هەروا بەرهەمێن نووسەرانی ناوخۆیی بەگشتی لە مندا کارتێکەر بوون. هەروەتر، ئەو کتێبانە کە لە نووسەرە کۆنەکانی ئێران بوو، ئێستا چ لە دەڤەری شێعر یاکوو پەخشان، بەگشتی لە مندا کارتێکەر بوون. بۆ نموونە، لە بیرمە ئەو کاتەی کە مامۆستای قوتابخانە بووم، تەواوی سێ مانگەکەی هاوینم بۆ خوێندنەوەی (شانامە)ی فێردۆسیی مەزن تەرخان کردبوو. واتە لە هەوەڵەوە تا ئەنجامی ئەم کتێبەم تێکڕا خوێندووەتەوە. ئەمە ئەو کاتە بوو، کە دەرچووی کۆلێژی ئەدەب بووم و دیارە گەنجیش بووم. دواتر (مەسنەویی مەولەوی)م تەواو کرد. (خەمسەی نیزامی)شم هەر لەو تافەدا خوێندووەتەوە. بڕوانە، من هێشتا نەچووبوومە زانکۆ، کە زۆربەی ئەدەبی کلاسیکی ئێرانم خوێندبووەوە، بەرهەمگەلی (سەعدی)م خوێندبوو. لە یادمە ئەو کاتە (شانامە)م دەخوێندەوە، هێندە کەوتبوومە ژێرپەنجە بەهێزوگوڕەکەی فێردۆسی، کە شێعرم وەکو ئەو ئەنووسی و کاتێ ئەمویست قسەش بکەم، قسەکانم وەزنی هەبوو. بەگشتی، تەواوی ئەو کتێبانە تەئسیرێکی زۆروزەوەندیان لەسەر من دانابوو.



بابەک: دوای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانت، ئاخۆ بۆ دواهەمین جار دەیانخوێنیتەوە و بەسەریاندا دێیتەوە؟
عەلی ئەشرەف: بەڵێ دەیانخوێنمەوە. بە ڕای من، نیوەی ئیشەکەی من دەبێ خوێندنەوە بێت. ئێستاش دەبێ زۆر شت فێر بم.

بابەک: نا، نا مەبەستم شتێکی دیکە بوو. بۆ نموونە ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری)



ت دوای چاپ خوێندووەتەوە؟

عەلی ئەشرەف: بەڵێ، خوێندوومەتەوە.

بابەك: تا ئێستا بۆت هەڵکەوتووە دەستێك بەسەر بەرهەمەکانی خۆت بکێشی و بەشێکیانی لێبگۆڕی یا پێ زیاد بکەی؟
عەلی ئەشرەف: لە خوێندنەوەکانمدا هەندێك جار وا هاتووەتە بەرچاوم، کە چەندە باش ئەبوو کە ئەو بەشەم دەقرتاند یان لەو بەشەدا فلاّن ڕووداوم بۆ دائەتاشی. قسەکەت جوانە. زۆرجار دانیشتووم و نوسینەکەم بە وردی خوێندووەتەوە.

بابەك: ئاخۆ تا ئێستا پێش هاتووە گۆڕانکارییەك لە چاپە تازەکانی کتێبەکانت بە ئەنجام بگەیەنیت؟
عەلی ئەشرەف: بڕوانە، من لە چاپی سێهەمی ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری)دا، بڕێ گۆڕانکاریم ئەنجام دا. واتە یەکجاری تەواوم خوێندەوە، کە زۆریش بە پێویستم دەزانی. واتە دەهاتم و ئەو شوێنانە، کە هەم زۆر و هەم درێژیش بوون، دەمقرتاندن. نەك ئەوەی کەسێك بێت و بە زۆرەملێ ئەم جۆرە ئەرکەم بەسەردا بسەپێنێت. کتێبی من لە ساڵی **1991**دا چاپ بوو و هەر لەو ساڵەدا بۆ دووهەمین جار هەمیسان لە چاپ درا. هەرچەند ماوەیەك لە ئیدارەی سانسۆری وەزارەتی فەرهەنگی ئێران مابووەوە، بەڵام دوای ساڵی **1991**، تا ساڵی **1997** ئیزنی چاپی ئەم ڕۆمانەم وەرنەگرت. هەر ئا لەم ساڵگەلەدا بوو کە بە هاتنەسەرکاری (دەوڵەتی خاتەمی)ی سەرۆككۆمار و موهاجیرانی (وەزیری فەرهەنگ) جۆرە ئاسانکارییەك لە وەزارەتی فەرهەنگ هاتە گۆڕێ. هەڵبەت نە تا ڕادەیەکی گونجاو و ئارمانی. ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری) کە بڕیار بوو لەو **2300** لاپەڕەی، دەبێ **700** لاپەڕەی بقرترێ، منیش بەم زوڵمە هەرە کەشەنگ بووم و

پێی قایل نەبووم و هیوای چاپەکانی دیکەشم هەر نەبوو. لە ئەنجامدا ناچارەکی قرتاندم و هەمیسان ڕۆمانەکە چاپ بوو، کە شیاوی باسە پێشوازییەکی فرەزۆری لێکرا. ئاماژەش بەم مەسەلەیە، من هەشت کتێبی دیکەم نووسیوە، کە تا ئێستا ئیزنی چاپیان نەداون، واتە شتاقیان چاپ نەبوون و هەروا لەسەر دەستم ماسیون.

بابەك: یەکێك لە گیروگرفتەکانی کۆمەڵگەی ئەدەبیی ئێران، کە زۆریش ڕەنگی داوەتەوە، نەبوونی هەڵوەستە و ڕوانگەیەکی تایبەتیی هەر نووسەرێکە لەمەڕ بەرهەمێن نووسەرانی دیکە. بە داخەوە بەم جۆرە کە دیارە ئێوەش خۆتان تووشی ئەم گرفت و تەنگژەیە کردووە. پرسیاری من ئەمەیە: ئاخۆ فەزای ڕەخنە لە کۆمەڵگەی ئەدەبیی ئێران هێندە ڕەچاو نەکراوە، گەندەڵ و ناخاوێنە، کە ئێوەش ناوێرن هەڵوێست و بیروبۆچوونی شەخسیی خوتان بخەنە ڕوو؟
عەلی ئەشرەف: یەکەمین مەسەلە کە لێرەدا شیاوی باسە، ئەوەیە کە بە داخەوە، بەگشتی، ئێمە خۆمان فێری ڕەخنەگەری نەکردووە. بە هۆی ئەوە کە ڕۆحییەیەکی زۆر زاڵمانە و دکتاتۆریمان هەیە. هەڵبەت ڕەخنەی گونجاو و شیاویشمان هەر بوونی نەبووە. زۆربەی ئەو ڕەخنەگەلە کە دەیانبینم، بەجێی ئەوەی بێت و لە خودی دەق و بەرهەم ورد بێتەوە، زەمەنی خۆی بە کەسێتیی بنووسەکە زەوت دەکا و بە لەونێك خۆیشی فریو دەدا. دەبێ ئەم کێشەیە بە لای چارەسەرکردن پەلکێش بکەین و هەوڵ بدەین تا فەزایەکی خاوێن و گونجاو بەسەر ڕەخنەدا زاڵ بێ. پێوەندیی بە منی ڕەخنەکار نییە ژیانی شەخسیی فلان نووسەر چۆنە. ئەگەرچی ژیانی شەخسیی نووسەر لە بەرهەمەکەیدا بە جۆرێك ڕەنگ دەداتەوە. ئێمە دەبێ تەنها چاومان لە دەق ورد بمێنێتەوە و ڕەخنەی باشی ئاڕاستەی بکەین، نەك بۆ خودی بنووسەکەی.

بابەك: ئێمە ڕەخنەکاری پرۆفشناڵ و لێهاتوومان نییە، کە ئەگەر بەرهەمێ لە چاپ درا، بێت و پسپۆڕانە و ڕاشکاوانە بیروبۆچوونەکانی بەرەوڕووی بەردەنگەکانی بکاتەوە. لەولاوە چەندین قۆناغی ئەدەبیمان تێپەڕاندووە، کە لەوانەدا ڕەخنەنووسی پرۆفشناڵمان بووە و گۆڤارە ئەدەبییەکان هەریەکە ڕەخنەگەرێکی تەواوکاتیان بۆ خۆیان دابین کردبوو. بەڵام ئیمرۆکە بە داخەوە وا نییە.
عەلی ئەشرەف: بە بڕوای من، ئەم باسە تا ڕادەیەك بۆ بارودۆخی ئێمەی مرۆڤ





لە کۆمەڵگەدا دەگەڕێتەوە. لەمەڕ ئەم مەسەلەیە، لە واقیعدا سانسۆریش بەرپرسیارە. ئێمە لە وڵاتێکدا ژیان دەبەینە سەر، کە ناتوانین بە ئازایەتی باسی هەر شتێك بکەین. بە بڕوای من زێترین کێشە لە لایەن خودی وەزارەتی ڕۆشنبیری وەدی هاتووە، کە کتێب بە مەیل و ئیشتیای خۆیان سانسۆر دەکەن، بۆیە ئەدەبیاتی ئێران پەرەی نەسەندووە. ئەگەر ڕەخنەکارێك بیهەوێ قۆڵ هەڵماڵێ و و لەم بوارەدا دەستبەکار بێت، پێویستی بە دۆخێکی تایبەتییە. کاتێکی درێژخایەنی پێویستە، کە ڕەخنەگەری شیاو بێتە گۆڕێ. هەڵبەت بەبێ مەترسی لە بیستن. بە درێژایی زەمەن، ڕەخنەگەری باش دەبێ ئالاهەڵگری هەموو نووسەر و شاعیران بێت و لەوان پێشکەوتووتر خۆی نیشان بدات. ڕەخنەگەرێکی باش لە کۆمەڵگەی ئێمەدا دەبێ بە زمانی زگماگی و بیانی ئاشنایەتی تەواوی هەبێت و بەرهەمی هەموو نووسەرە بیانییەکان بخوێنێتەوە و ئاگاداریی بەسەر هەموو ڕووداو و دیاردەکانی ڕەخنە و گۆڕانکارییەکانی جیهانی وێژەوانی هەبێت و ئاوڕێکی تەواوەتییان لێبداتەوە. بە داخەوە، بەتایبەت دوای ڕاپەڕینی مەشروتە، ئێمە بەگشتی لەژێر زەبری سانسۆردا ژیانمان کردووە. بەردەوام بە کوشتن و خنکاندن و لێودوورینی شاعیر و نووسەران و بەگشتی جەماوەری ڕۆشنبیر بەرانبەر بووین و ئیدی پەرەمان نەسەندووە و بە داخەوە کۆمەڵگەمان بەم چەشنە کلۆڵە و بە چەرمەسەرییەوە هەڵکەوتووە.

بابەك: دیدگای ئێوە لەبارەی ئەو ڕۆمانگەلە کە لەم چەند ساڵەی دواییدا چاپ بوون، چییە، بەتایبەت ڕۆمانی (ئازادە خانم) ی دکتۆر ڕەزا بەراهەنی، کە تاقمێك لەو باوەڕەدان ئەم بەرهەمە سەرەڕای ئەوەی لەمەڕ ستایل و تەکنیکەوە زۆر بەنرخە، جۆرە سەرکەوتنێك بۆ ئێمەیە لە مەیدانی بەرینی ڕۆماننووسیندا. هەر بۆ ئەمەیە کە پەسەندیش کراوە.
عەلی ئەشرەف: ئەگەر بڕوام پێدەکەن، من تا ئێستا ئەم ڕۆمانەم نەخوێندووەتەوە، بەڵام لەمەڕ ڕۆمانەکانی ئیمڕۆ، دیارە نووسەر دەبێ

هەوڵێکی زۆر بدات. هەڵبەت هەر هونەرمەندێ ئازادە بە ڕەوشتگەل و گرەوشتی تایبەت و جۆراوجۆرەوە لەم کارەدا ڕچەشکێن بێت. ئەمە کێشە نییە، بەڵام کەسێکی وەك من بایەخی زۆر بە خوێنەرەکەم ئەدەم و پێم باشترە جۆرێ بنووسم، کە خوێنەر لە ڕۆمان و دەقەکەم تێبگا. من وای بۆ دەچم گۆڕانکارییە ئەدەبییەکان کە لەم کۆمەڵگەیە ڕەخساون، لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، یان لەگەڵ گۆڕانکارییە پیشەسازییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە هەروا لەگەڵ گۆڕانکارییە ڕامیارییەکان، پەیوەندییەکی هەرە سفتوسۆڵی ڕەخساندووە. تەنانەت پەیوەندییەکی سەرڕاستیشی هەیە. لە کۆمەڵگەدا دەبێ ئاڵوگۆڕێکی گونجاو برەخسێت و نووسەر و هونەرمەند دەبێ لەگەڵ ئەم ئاڵوگۆڕە خۆی هاوتا بکات. شێوازی جۆراوجۆر چەشنی (شەپۆلی هۆش) بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی پێویستە. ئەم گۆڕانکارییە لە ئەدەبدا ڕێ دەخرێت. بەڵام شرۆڤەکانی ئێمە هەمیشە و بە تەواوی کتوپڕی و بە ڕێکەوت بووە. واتە ئاوای بۆ دانێین کۆمەڵگە لە قۆناغی دەرەبەگایەتیدایە، بەڵام ئێمە ئەمانەوێت وەك نووسەرێك لەمەڕ کۆمەڵگەی پیشەسازی و مۆدێرن بنووسین. بەم هۆکارەیە کە ئێمە تێك شکاوین و هەستکردن بە داڕماوی تەواوی ژیانی ئێمەی گرتووەتەوە و لەم دەڤەرە بە هیچ شێوەیەك سەرکەوتوو نەبووین.

بابەك: بەڕێز دەروێشیان، مەگین ئێمە چەند نووسەری سەرمان هەیە. ئەمە چۆنە کە نووسەرێ وەك ئێوە دەڵێت ئەو ڕۆمانەم نەخوێندووەتەوە، کە لە ڕۆمانە تاقوتەراکانی ئەم چەند ساڵەیە؟

عەلی ئەشرەف: ڕاستەکەی بڵێم، من وەختم نەبووە. بڕوانە، ئەم ڕۆمانە لە دۆخێکدا بڵاو بووەوە، کە دەزانن بارودۆخی کۆمەڵگە بەو هەموو ڕووداوە هەرە ناخۆش و دڵتەزێنە کە بۆ نووسەران ڕووی دا، چۆن بوو. لەولاوە زۆریش سەرقاڵ بووم. ئەگەرچی سەرپەرژانی دیکەشم هەبوو. بۆ خوێندنی ڕۆمان دەبێ بتوانی هۆشوگۆشت کۆ بکەیتەوە هەتا لە سەروبەری ڕۆمانەکە تێبگەی. دواییش سەفەرێکی دوورودرێژ هاتە بەر و ئێستاکە دەبێ دانیشم و بیخوێنمەوە.

بابەك: بە ڕای ئێوە کەی دەتوانین لە ئەدەبی پۆستمۆدێرن ببینە خاوەن ئەزموون یاخود بەم شێوە بنووسین؟

عەلی ئەشرەف: ئەو کاتەی کە کۆمەڵگەی ئێمە نیشانەکانی پیشەسازیی تێدا





هاتبێتە کایەوە. ئەو کاتەی گۆڕانکارییەك لە کۆمەڵگەی ئێمە ڕوو بدا و هەموو شتێك، بگرە
لە مۆسیقاوە کە دیارە لە هەموو هونەرەکان ناسکتر و بەهەستترە، ئاڵوگۆڕی بەسەریدا بێت.
لە مۆسیقای ئێمەدا ئەم ئاڵوگۆڕە نەڕەخساوە تا لە ئەدەبیشدا بڕەخسێت. دەبێ دوای ئەمە
لە ئەلفوبێی نیگارکێشان و هونەری شێوەکاریدا، کە زۆر سۆزمەندانە و بەهەستترە،
خۆی بەرجەستە بکاتەوە و ئینجا لە شانۆدا بێتە ئاراوە، لە دوایین قۆناغدا بێتە نێو
خانەی ئەدەبەوە.

بابەك: لە جیهانی مۆدێرندا وا هەڵکەوتووە کە ئەم گۆڕانکارییە سەرەتا لە مۆسیقا
و هونەری شێوەکاریدا ڕووی داوە، ئینجا دێتە نێو دەڤەری ئەدەبەوە. بەڵام ئێمە لە
بواری مۆسیقا و نیگارکێشیدا هەمیشە تووشی کەموکوڕی و گیروگرفت بووین، بۆیە
دەبێ ئەم ئاڵوگۆڕییە لە یەکەم پلەدا لە ئەدەبەوە سەرچاوە بگرێت.
عەلی ئەشرەف: بە بڕوای من، ئەم گۆڕانکارییە لە ئەدەبی وڵاتانێك چەشنی وڵاتی
خۆمان (ئێران) زۆر ساختەیی و ناڕاستەوخۆیە. لێ یەکێك دێ و چیرۆکێك دەنووسێ،
ئێمەش لەبەر ئەوەی لەو دوا نەکەوین، دێین و وەك ئەو ئەنووسین، کە لە واقیعدا ئەم
شتە لە ناخی ئەو نووسەرەوە هەڵنەقوڵاوە. لە ناخی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکەی ئێمەدا
بەرهەم نەهاتووە و چ پێشینەیەکی بۆ ڕەچاو نەبووە. واتە چ بنچینە و کۆڵەکەیەکی بۆ
دابین نەکراوە، کە هەڵبەت دەبێ دابین بکرێت.

بابەك: ئیمڕۆکە گۆڕانکارییەك لە گۆڕەپانی ڕۆماننووسین لە هەموو جیهاندا
وەدی هاتووە. ئیدی ئەو ڕۆمانگەلە کە بە شێوازی کلاسیك و کۆنەوە
ئاڕاستە دەبوون، پەسەند ناکرێن و بایەخیان پێنادرێ. ئەم گۆڕانکارییە
وەکو ئەو شێواز و ڕێکارەن کە (میلان کۆندێرا) لە ڕۆمانەکانی بەکاری
هێناوە. ئێوە چلۆن ئەم مەسەلە ڕاڤە دەکەن؟
عەلی ئەشرەف: بە ڕای من، میلان کۆندێرا نووسەرێکی تایبەت نییە.

نازانم بۆچی؟ برێ جار وا هەست ئەکەم کە چونکە لە پارتی کۆمۆنیست دەرکراوە، هەموو ئەو شتانە کە لە دەقەکانیدا باسیان دەکا، بە هۆی گرێیەکە، کە لە جەماعەت و جەماوەری کۆمۆنیست بوویەتی و بەم چەشنە لە ڕۆمانەکانیدا دەری خستوون. بە هەر ڕووی، منیش مافی خۆمە ڕوانگە و هەڵوەستەی شەخسیی خۆم ئاڕاستەی خوێنەر و بەردەنگ بکەم. پێشوازییەك کە لە ئێران لە دەقەکانی کوندێرا دەکرێ، بە ڕای من پێشوازییەکی ڕاستەکی و حەقیقیی لە پشتەوە نییە، لێ ئەو کەسانەی کە دەقگەلی کۆندێرا دەخوێننەوە، تەنها دەیانەوێت کتێبێکیان خوێندبێتەوە. ئەمەش بە جۆرێك بۆ خوێنەر دڵخۆشکەرەیە. ئێمەیش لەو سەردەمەدا وابووین. بەڵام با ئەم قسە لێرە دەربڕم کە دەقەکانی کۆندێرا بەدڵم نین. نازانم بۆ؟ بە جۆرێك هەست بە نامۆیی دەکەم لەگەڵیاندا. هەموو بەرهەمەکانیم خوێندووەتەوە، بەڵام چ چێژێکم لێنەبردوون.

بابەك: ئەو پێشنیازە کە میلان کۆندێرا لە ڕۆماندا هێمای بۆ کردووە، بە چ شێوەیەك دەنرخێنن؟
عەلی ئەشرەف: ئەم گرەوشت و شێوازگەلە بە هەر ڕووی، ڕێ و ڕەوشتێکی نوێیە، کە دەبێ کاری لەسەر بکەین. بڕوانە، ئەگەر بڕیار وابێت کە هەموو ڕۆماننووسەکانی دونیا، هەموو نووسەران هەریەکە و بە یەك شێوە بنووسن، دیارە ئێمەیش تەنها دەچین و بەرهەمی یەکێك لەو نووسەرانە دەخوێنینەوە. بەڵام زاتی هونەر ئەوەیە کە جۆراوجۆرە. هونەر واتە جۆراوجۆری. واتە بە شێوەی جۆراوجۆر تەماشای جیهان بکەین و لێی ورد ببینەوە. واتە ئەو قسەی کە من بە شێوەیەك دەری دەبڕم، ئێوە بە چەشنێکی دی سەیری بکەن. هونەر واتە کەسێتیی خودی مرۆڤ؛ چونکە کەسێتییەکان جیاوازن، دیارە هونەریش دەبێ جیاواز بێت. هەر کەسێك دەتوانێت و ئەو مافەی هەیە کە شێوازگەل و ڕێکاری چەشناوچەشن بخاتە بەر ئەزموونکردن، بەڵام من دەڵێم دەبێ شێوازێك بەدی بێنم، کە لەگەڵ خوێنەرەکەم هاوتا بێت و لێی حاڵی بێت. واتە بتوانم پەیوەندییەکی سفتوسۆڵ و لێهاتوو و ئینسانی لەگەڵ خوێنەر چێبکەم. ئامانجی من ئەوەیە. چونکە کێشەی گەورەی کۆمەڵگەی خۆمان بە جۆرێك لە کەمتەرخەمی بۆ خوێندنەوە دەبینم. پێم خۆشە ئەم کولتووره پەرە بسێنێ. من دژ بەو کەسانەم، کە دەڵێن تاقە بەرهەمێك بە تەنهایی ناتوانێت جیهان بگۆڕێت. بە پێچەوانەی ئەوان، دەڵێم ئەم شتە دەگونجێ. تەنها یەك





بەرهەمیش دەتوانێ تا ڕادەیەکی کەم لەسەر ئەم جیهانە کارتێکەریی خۆی بقەبڵێنێت.

بابەك: کەواتە هێرشی کۆمەڵگەی ڕووناکبیری یاخود نووسەرە ڕۆشنبیرەکانی خۆمان بۆ سەر بەرهەمگەلی نووسەرانێك وەك فەتانە حاج سەید جەوادی لە ڕۆمانی (بەیانیی خومار) و نووسەرانێکی دیی وەك (فەهیمە ڕەحیمی) چۆن هەڵئەسەنگێنن؟

عەلی ئەشرەف: من دژ بەو بەرهەمانە نیم. تەنانەت لەگەڵ ئەو شێعرانە کە لەسەر دەستی شاعیرە گەنجەکان دێنە ئاراوە، چ جۆرە دژایەتیم نییە. هەڵبەت لە کەسێکیش ناو نابەم. ئەگەرچی فرۆشی ئەم جۆرە بەرهەمگەلە کەم بووە، بەڵام هەروا کە ئاماژەم پێدا، چ دژایەتییەکم لەگەڵیاندا نییە. من لە کاتی خۆیدا کتێبەکانی (محەممەد حیجازی و جەواد فازڵ) م خوێندوونەتەوە. پێمان خۆش بێ یا نەبێ، ئەم جۆرە بەرهەمانە لە وڵاتی ئێمە بوونیان هەیە. لە وڵاتانی دیکەش هەمموو جۆرە دەقێك بۆ ویستی خوێنەران چاپ دەبێت. لە فێرکاریی سەرەتاییەوە بگرە تا دوایین قۆناغ، لە جەماوەری عەوامەوە بگرە تا جەماوەری ڕۆشنبیر. هەرکەسە و بەقەد زەوق و لەززەتی خۆی دەچێ ئەو کتێبانە کە پێی خۆشە، دەکڕێت و دەیخوێنێتەوە و کەسیش پێی ناڵێت تۆ بۆ ئەم کتێبەت نووسیوە یا بۆچی ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە. بە هیچ لەونێك وانییە.

بابەك: کەواتە، باسی (ئەدەبی پابەند) چیی بەسەر دێ؟ یان ئەم ڕوانگەیە کە دەڵێت نووسەر نابێ شوێنگری هەستە زووپەڕەکەی خوێنەر بێت؟ یاخود ئەو ڕوانگەیە کە دەڵێت نووسەر دەبێ خوێنەرەکانی هەڵکێشێتە بان. بۆ ئەم مەسەلەگەلە دەبێ چی بکەین؟

عەلی ئەشرەف: پابەندی لە وێژە و ئەدەبدا بابەتێکی تایبەت بە خۆی هەیە. من چاوەڕێی ئەمە نیم هەمموو نووسەران بڕوایان بە (وێژەی پابەند) هەبێت. چ کەسێك وەهای نەوتووە. بەهەرحاڵ، پێم خۆشە

نووسەران پابەند بن. بەڵام ئەگەر نووسەرێك پابەند نەبێت، چ دەسەڵاتێك نابێت بەرگری بكات. لە واقیعدا ئەزموون و ژیان و تایبەتمەندیی سروشتی و ڕۆحی ئەو نووسەرە دەبێتە هۆی ئەوە كە بەو شێوە تایبەتییە بنووسێت. بەڵام من ناتوانم ئەوان بگۆڕم. ڕەنگە بتوانم ئاڵوگۆڕێك لە نووسینەكانمدا بڕەخسێنم. ئەو نووسەرە ئازادە كە بە هەر چەشنێك دەیەوێت بنووسێت. ڕوانگەی من ئەمەیە كە ئەو نووسەرە، ڕزگار لە هەر ئاستەنگێ، چیی پێ خۆشە، دەبێ بنووسێت. لە ڕاستیدا بە ڕای من هەموو كەسێك بۆ نووسین ئازادە. مەبەستم ئازادیی لە دەربڕین و لە ئەندێشەدا. من دەتوانم ڕەخنەی لێبگرم، بەڵام ناتوانم پێی بڵێم ناتوانێ بنووسێت. دەبێ بنووسێت و بڵاوی بكاتەوە. هەڵبەت دوای چاپ و پێش بڵاوبوونەوە، نابێت هیچ بەرهەمێك سانسۆر بكرێت. نووسەر ئەگەر دوای چاپیش تاوانبار بێ، دەبێ بچێتە دادگا و لە واقیعدا ئەوە خودی نووسەرە، كە لە بەرانبەر دەقەكەی بەرپرسیارە.

بابەك: كەواتە لەو بڕوایەدان كە ئەدەب لە بنەڕەتەوە دەبێ بەرهەڵست و نەیار و ڕەخنەگەر بێت؟
عەلی ئەشرەف: هونەر و ئەدەب لە بنەڕەتەوە واتە ڕەخنەگەری و لاساری و بەرهەڵستبوون. دەبێ ئەم دیدە لە ئەدەبدا بەردەوام بێت. هونەرمەندان دەبێ دژ بە بێدادی و زوڵموزۆر ڕابوەستن و سەركێشانە بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێن. بۆچی؟ چونكە هونەرمەند دەتوانێت فامی ئەم شتانە بكات. چونكە هونەرمەند لە كۆمەڵگەدا دەژی. لەگەڵ جەماوەری عەوامدا ژیان دەباتە سەر و لە چاوی خۆیەوە لە هەموو شتێك دەڕوانێت و ورد دەبێتەوە.



بابەك: بەڕێز دەروێشیان، دەتوانین هەموو ئەم ڕەخنە و بەرهەڵستبوونە لە بەیاننامەیەكدا داتاشین. بە ڕای من، ئەدەبی ئیمڕۆ لەم باسوخواسە جیا نییە؟
عەلی ئەشرەف: هەڵبەت دەبێت ڕەسەنیەتیی هونەر لە دەربڕینی ئەم مەسەلەیەدا فەرامۆش نەكەین. ئەم مەسەلەیە دەبێ لە ڕێچكەی هونەرەوە ئاوێتە بێت. چونكە لە ئەدەبدا تەئسیرەكەی فرە قووڵترە تا ئەو ئاگادارنامەیە، كە ڕەنگە كارتێكەرییەكی زووتێپەڕی هەبێت. بەڵام چیرۆكێكی لێهاتوو و شیاو تەئسیرێكی درێژخایەنتر ئاڕاستەی كۆمەڵگە دەكات و لەگەڵیان ژیان دەباتە سەر و ڕێچكەیەكی ڕەسەنیان بۆ دەڕەخسێنێ. هەر كاتێ ئەم چیرۆكە دەخوێنینەوە،

ئەو دۆخەی کە تێیدا ژیاوین، هەمیسان بۆمان ئەژێتەوە. لەم چل ساڵەی ڕابردوودا تاقمێك نووسەر هەبوون، کە بەرهەمی هەرمانی و بەکەڵك و بایەخداریان داهێناوە، بەڵام ئیمڕۆکە بگرە هیچ نیشانەیەك لە دەقەکانیان نییە. دەیانویست تێکستێکی هەرمانی داهێنن، بەڵام لە ئاساییترین مەسەلە ڕۆژانەییەکانی خۆیان دوا کەوتن و بە تەواوی فەرامۆشیان کردووە. باشتر ئەوەیە بڵێم تووشی مەترسی بوون، کە بێن و بە ناخی کێشەکانی خۆیان بچنەوە. چونکە نووسین لەمەڕ کێشەکانی خەڵکی هاوچەرخ، گیروگرفت دەخولقێنێت. بەڵێن دەدەم لە **30ـ40** ساڵی داهاتوودا، هێندە ئاڵوگۆڕ دێتە ئاراوە، کە کەسێك ناوێك لە مرۆڤە بلیمەت و بەناوبانگەکان نابات. ئیمڕۆکە ئەم نیشانگەلە لە کۆمەڵگەی خۆمان بە زۆری دیارن.

بابەك: دوای ڕاپەڕینی ساڵی **1357**ی ئێران، نووسەرانی ژن لە کۆمەڵگەی ئێراندا چالاکییەکی ئەوتۆیان گرتە بەر و بەرهەمی گرینگ و بایەخداریان لەم بوارەدا وەدی هێناوە. پێمان خۆشە بزانین ڕوانگەی ئێوە لەمەڕ ئەدەبی ژنانە چییە؟
عەلی ئەشرەف: نە تەنیا لە وێژە و ئەدەب، بەڵکو لە هونەرگەلی جۆراوجۆر ژنان گەشەیان بە زۆر شت داوە. بەهەرحاڵ، ژنان هەستیان بەم شتە کردووە، کە لە کۆمەڵگەدا بڕێ کەموکوڕی و گیروگرفت هەن و لە ڕێچکەیەکی دییەوە دەستیان داوەتە ئەزموونکردنی نووسین و کەوتنە شوێنی هونەری خۆیان. لە دەرهێنانی فیلم، لە شانۆگەری، لە نیگارکێشی و فیلمنامەنووسین و لە شێعردا زۆر تێکۆشەرانە چوونەتە پێشەوە. بە تایبەت لە ئەدەبی چیرۆك، خۆیان باش وەدەرخستووە، کە ئێستاکە دەتوانم چەند کەسیان ناو بەرم: (زۆیا پیرزاد، فەریدە ڕازی، فەرخوندە ئاغایی، ناهید تەباتەبایی). من ڕەخنەم ئاڕاستەی بەرهەمی چەند ژنە نووسەریش کردووە. لە دەقگەلی ئەوان زۆر ورد بوومەوە و بە ڕای من کەسێتیی سەرکەوتووی باشیان تێدا هەڵکەوتووە.

بابەك: تۆزێك لەبارەی کتێبی (کولتووری ئەفسانەگەلی نەتەوەی ئێران)یش بڵێن. بەشەکانی دیکەی ئەم پەرتووکە چۆن بە ئەنجام گەیشتوون و چی بووە هۆی ئەوەی قۆڵ بۆ ئەم پەرتووکە هەڵماڵی و چۆنت کۆ کردنەوە؟

عەلی ئەشرەف: لە منداڵیدا داپیرێم ئەفسانەی زۆری لە سەرزار بوو و بۆ ئێمەی دەگێڕایەوە. دوای ڕاپەڕینی **57**ی ئێران، ئەو کاتە کتێبەکانم ئێزنی چاپیان وەرنەدەگرت، قۆڵم هەڵکرد بۆ نووسینی ڕۆمانی (ساڵیانی هەوری). هەڵبەت منیش وەك هەر کەسێك دەبا ژیانم بکردایە. نەمدەویست بەر لە نووسین ئیشێکی دی بکەم. بەڵام ژیانم بە دەستەنگی تێدەپەڕی. بۆیە بڕیارم دا ئەو ئەفسانەگەلە لە قەوارەی کتێبێکی سەربەخۆدا داڕێژم. کتێبی هەوەڵ نزیکەی **135** ئەفسانەی دەگرتەوە و لەولایشەوە بۆ چاپکردنی، گیروگرفتی زۆرمان لەگەڵ وەزارەتی فەرهەنگ هەبوو. هەتا ئەوەی کە توانیمان لە دەوڵەتی بەڕێز خاتەمی سەرۆككۆماری ئێران، ئیزنی چاپ وەرگرین و دەرەنجام بڵاو بووەوە. کتێبی دووهەمیش بڵاو بووەوە. ئەم کتێبە ڕەنگە ببێتە پانزە بەرگ و زۆربەشی تەواو بووە.

بابەك: دوای هەڵوەشاندنەوەی کەمپی سۆشیالیزم یاخود (ستالینیزم)، ئاخۆ تیۆری ڕاستەوخوازی سۆشیالیزم لە ئەدەبدا تێکڕا داخرا و بوونی نەما؟ بۆ نموونە لە وڵاتی خۆمان دیارە کەسێك شوێنی بەرهەمەکانی (ماکسیم گورکی) نەکەوتووە.

عەلی ئەشرەف: مەگین لەم کۆمەڵگەیەدا بەرهەمی (گورکی) بە درێژایی ئەم ساڵانە چاپ بووە کە ئێوە وا دەڵێن؟ بە درێژایی ئەم بیست ساڵە کام بەرهەمی (گورکی) ئیزنی چاپی وەرگرتووە؟ من لە بیرمە تەنها کۆمەڵەچیرۆکێکی (گورکی) لە لایەن (عەبدوڵڵا تەوەکول)ەوە وەرگێردرا و لەم دواییەشدا چاپ بوو. کتێبێ کە چاپ نەبێ، چۆن نەوەی گەنجی ئێمە بزانێت گورگی چۆن نووسەرێك بووە و چۆن ڕوانگەیەکی بە نیسبەت جیهان هەڵبژاردووە تا شوێنی بەرهەمی بکەوێت؟ نەوەی گەنج تا چاو هەڵێنێت، ڕۆمانی بێبایەخ دەبینێ، کە لە دەوراندەوری هەڵچنراوە. ئەو بەرهەمە کە لە چاخی ئێمە چاپ دەبوون، بە ڕاستی ئێمەی دواخست، ئێستا تیرێژێکی سەیروسەمەرەی هەیە. بۆچی وای لێهاتووە؟ بۆچی بەرهەمی گورکی چاپ نابێت؟ بۆچی کارەکانی (شۆخۆڵۆف) چاپ نابن؟ ئیزنی چاپ بەم جۆرە کتێبگەلە نەدراوە. منداڵانی ئێمە لەگەڵ ئەم جۆر بەرهەمگەلە ئاشنا نین. بڕوانە، لە ڕووی





کارەکانی گورکی چەنها فیلم دروست کراون.

بابەك: بەڕێز، تیۆرزانی لە ئافراندندا تا چ ڕادەیەك دەتوانێت یارمەتیدەری نووسەر بێت؟

عەلی ئەشرەف: ئەگەر لە سەد نووسەر بپرسن کە ئاخۆ ئێوە لە سەرەتاوە تیۆری چیرۆکنووسینتان خوێندووەتەوە یان ئەوەی دوای نووسەربوون ئەم تیۆرگەلە فێربوون، بە ڕای من نەوەدوپێنج کەسیان دەڵێن لە پلەی یەکەمدا نووسەرییان دەست پێکردووە و دوایی لە ڕێچکەی خوێندنەوە و ئەزموون و حەزەوە فێری تیۆری بوون. من خۆم یەکێك لەوانەم. پاش ئەوەی چەند چیرۆکم نووسی، دەستم کرد بە خوێندنەوەی تیۆری ئەدەبی. بە بڕوای من، خوێندنی ئەم تیۆرگەلە ڕەنگە ئێمە بە جۆراوجۆرییە ئەدەبی و ڕێبازە بەرفراوانەکان و پێکهاتەی چیرۆك ئاشنا بکات، بەڵام کەسێك کە ئەمانەی خوێندووە، ڕاستەوخۆ نابێتە نووسەرێکی لێهاتوو. ئەزموونکردنی ژیان، بە بڕوای من، لە هەر شتێکی دی گرینگترە.

بابەك: تا چ ڕادەیەك بایەخ بۆ ستایل و فۆرمی چیرۆك دادەنێن؟

عەلی ئەشرەف: ئاگاداری لە فۆرم، ستایل و تەکنیکی چیرۆك زۆر باشە. بەڵام دەبێ بزانین ئەم فورمە بۆچییە و لە کوێ بەکار دێ؟ فۆرم بەکاری ئەوە دێت، کە من بتوانم بەهۆیەوە ئەو شتەی کە هەستی پێدەکەم، بە شێوەیەکی شیاو و لێهاتووتر بۆ خوێنەر بگێڕمەوە. فۆرم لێرەدا بۆ گواستنەوەی چەمك و هەستەکان بایەخدارە. بەڵام ئەگەر من بتوانم بەو هەستە کە هەمە، ئەم چەمکانە ئاڕاستەی خوێنەر بکەم چی؟! تەنانەت ئەگەر باشتر لەو کەسەی کە بە تەکنیکی گونجاوترەوە دەنووسێت، ئێوە چی دەڵێن، ڕەنگە ڕەخنەم لێبگرن. نووسەرمان هەیە وەك (چیخۆف) کە خۆی لەژێر پەنجە بەهێزەکەی تەکنیك ڕزگار کردووە، بەڵام بەرهەمگەلی ئەو ئێستاش بۆ خوێنەر سەیر و تازەیە، هەڵبەت من ئاماژەم بەم مەسەلە کرد و ئەوەیشم

وت، که زانیاری لەمەڕ تەکنیك زۆر باشە و زۆریش یارمەتیدەرە. بەڵام ئەگەر ئێستا ئاوڕێ لە چیرۆکەکانی (چیخۆف) بدەنەوە و ناوی کەسایەتییەکانی بگۆڕن و ناوێکی ئێرانیی بۆ داتاشن، هەست دەکەن کە خەریکە چاخی ئێوە وەسف دەکات. چیخۆف هێندە بایەخ و گرینگایەتیی بە فۆرم نەداوە. ئەمە کێشە نییە و نابێت ڕەخنە لە نووسراوەکەی بگرن.

بابەك: ئێوە لەم چەند ساڵەی دواییيەدا هەژمارەدەیەك لە کۆبەرهەمی (سەمەد بێهرەنگی)تان لە چاپ داوە. پەیوەندی و هاوڕێیەتیی ئێوە لەگەڵ ئەم نووسەرە تا چ ئاستێك بوو؟
عەلی ئەشرەف: منیش میناکی (سەمەد بێهرەنگی) لەو تافە بوومە مامۆستا، کە ئەویش ببوو و کەمتاکورت ژیانێکی هاوشێوەمان بوو. هەردوومان دەرچووی پەیمانگە بووین. ئەو بەرەو گوندەکانی ئازەربایجان ڕۆیشت و منیش بۆ گوندەکانی کوردستان. یەك ساڵ لە من بەتەمەنتر بوو. کاتێ چوومە زانسگە، لەو کەسانە کە زۆر لەسەر من تەئسیریان هەبوو، یەکیان (جەلال ئال ئەحمەد) بوو، گەرچی دژی بە بیروبۆچوونەکەی بووم. جەلال لە پەیمانگە وەکو ئاگر بوو. هەروەتر دوکتۆر (ئاریانپوور) و (سیمین دانشوەر) لە مندا هەرە کاریگەر بوون. ئەگەر نەچووبوومایە پەیمانگە، دیارە ئەم گۆڕانکارییەم بەسەردا نەدەهات.

پەراوێزەکان:

ڕوونکردنەوەی گشت پەراوێزەکان لە لایەن وەرگێڕەوە بەم وتووێژە زیاد بووە.





# گولی تەرەقی

## یادەوەرییەکان پێش ئەوەی یادەوەری بن، چیرۆکن...

**سازدانی: مەهدی یەزدانی خورڕەم**
**و. لە فارسییەوە: بەیان ڕەشیدی**

**"گولی تەرەقی" پتر لە دە ساڵ بوو هیچ بەرهەمێکی بڵاو نەکردبووەوە، یان نەیتوانیبوو بڵاوی بکاتەوە، بەڵام ئەمساڵ بۆ ئەو ساڵێکی بە بەرەکەت بوو، سەرەتا بە چاپکردنی کۆمەڵەچیرۆکی "دەرفەتی دووبارە" دەستی پێکرد و کۆتاییەکەشی ڕۆمانی "ڕووداو" بوو.**
**ڕۆمانەکە فرۆشێکی زۆر باشی هەبوو و پێشوازییەکی بەرچاوی لێکرا و توانیی سەرنجی خوێنەران ڕابکێشێ. لەم گفتوگۆیەدا "تەرەقی" باس لە ئەزموونی نووسینی و گرفت و کێشەکانی بەردەم نووسین دەکات، زۆرترین قسەش دەربارەی "ڕووداو"ە، کە یەکەمین ڕۆمانیەتی.**



دوای پەنجا ساڵ نووسین، ئینجا یەکەم ڕۆمانی درێژت بڵاو کردووەتەوە. هۆکاری ئەم دواکەوتنە چی بوو؟

گولی تەرەقی: چونکە بێخەبەر بووم لە فریوی زەمەن، پێم وابوو هێشتا کاتی زۆرم ماوە بۆ نووسین. "کوا هەتا بگەمە چل ساڵەیی...!" بەهەرحاڵ، هەر لەدایکبوون و ئافراندنێك پێویستی بە کاتی گونجاوی خۆی هەیە. نهێنییەك لەم کارەدا هەیە، نهێنییەك کە من و تۆ بێئاگاین لێی. کاتێك بۆ لەدایکبوون هەیە و کاتێك بۆ مردن. لەوانەیە بە تەواوەتی ئامادە نەبووبم بۆ نووسینی ڕۆمانی درێژ. سەرەتا سەرسام بووم بە نووسینی کورتەچیرۆك و کاتە چڕەکەی، هەڵبژاردنی وشەکان. لە کورتەچیرۆکدا بەکارهێنانی وشەیەکی شاعیرانە لە تەنیشت وشەیەکی گشتی، بە لەبەرچاوگرتنی مۆسیقای هەریەك لە دێڕەکان، زۆر گرینگە. شوێنێك بۆ زۆربڵێیی و شپرزەیی نییە. کورتەچیرۆك هاوشێوەی سۆناتێکە، نۆتەیەکی هەڵە و نەگونجاو، بینای دەروونیی تێك دەدا. لەبەر هەڵبژاردنی وشەیەکی دڵخوازم، چەندین جار خۆمم ئازار داوە.

بۆ نموونە، پێم خۆشە دێڕێك بە دەنگێکی کشاو وەکو "ئا"، هاوشێوەی هەناسەیەکی درێژ کۆتایی پێبێت. بە دەنگی بەرز دەیخوێنمەوە و دووبارە دەینووسمەوە. نووسینەوە... نووسینەوە... و نووسینەوە. تاسەیەکی زۆر، یان ختوورەیەکی بێچارەسەرە.

لە کورتەچیرۆکدا هەر وشەیەك بەرپرسە و شوێنێکی دیاریکراوی هەیە، وەکو ڕیتم و لێدان و چرپەچرپی وشەکان لە شیعردا. کات و شوێن لە ڕۆماندا پەرشوبڵاون، بەڵام ئەم پەرشوبڵاوییە وەکو جودایی ئەستێرە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆرە، کە لە سروشتدا پێکەوە بەسراونەتەوە. هاوسەنگی و مانەوەیان لەو پەیوەندییە گەردوونییەدایە، کە لەگەڵ یەکتر هەیانە.

**نووسینی ڕۆمانی "ڕووداو"ت لە سەرەتای ساڵانی دووهەزار دەست پێکرد؟**

گولی تەرەقی: پێم وایە حەوت، هەشت ساڵ لەمەوپێش بوو. بەسەرهاتەکان یەك لە دوای یەك ڕێگەی خۆیان دەدۆزییەوە و ڕۆمانەکە بەرەوپێش دەچوو. پێداچوونەوە و دووبارە نووسینەوەکانی چەندین جارە بۆ دواتر بوون. کورتم کردەوە و پەنجا لاپەڕەیم وەلا نا. کتێبەکەم بە بێئومێدی نارد بۆ "ئیرشاد". "ئێرشاد"ی سەردەمی حکومەتی "بەڕێز ئەحمەدی نەژاد" بوو. دانیشتم و چاوەڕوانم کرد. (کەرە مەمرە، بەهارە!) دوو بەهار تێپەڕی و کورتان نەگەیشت و هەواڵێك نەهات. دوای دوو ساڵ وتیان: "شایانی چاپ نییە، خواتان لەگەڵ، باشترە بە ڕێز و ئیحترامی خۆتانەوە بڕۆن".

**ببوورە قسەکەت پێدەبڕم، یانی کتێبەکە هەر وا بە هەڵپەسێردراوی مایەوە؟**

گولی تەرەقی: ڕێك وایە، بێدەنگییەکی تەواو. نە ڕازیبوون و نە ڕازینەبوون. تا ئەو کاتەی ماندوو بووم. هەستام و ڕۆشتم بۆ "وەزارەتی ئیرشاد"، بەشی هەڵسەنگاندنی کتێبەکان. لەوێ پیاوێکم بینی. بە سەرسووڕمانەوە گوێی بۆ قسەکانم گرت و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە وتی: "شتی وا مومکین نییە! هیچ کتێبێك زیاتر لە پانزدە ڕۆژ لە ئیرشاد نامێنێتەوە". دواتر تەلەفۆنێکی کرد و فەرمانی دا لە زووترین کاتدا بەدواداچوونی بۆ بکەن. بەدواداچوون!!! جارێکی تریش گەڕامەوە. وتیان "بەڕێز گرینگ!!!" بە جووتێك نەعلی لاستیکەوە ڕۆشتووە بۆ سەفەر. کەی دەگەڕێتەوە؟ خودا دەیزانێ...

کتێبەکەم وەرگرتەوە، وەکو ئەوەی ڕۆڵەیەك لە سەفەرێکی سەخت گەڕابێتەوە، هێنامەوە بۆ ماڵ. دەرفەتێکی باش بوو بۆ دووبارە نووسینەوە و پێداچوونەوەی. بەبێ ئەوەی لە خەیاڵیشمدا بووبێت!

**ئێستا کە دوو ساڵ لە گۆڕانی دەوڵەت تێپەڕیوە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی مۆڵەتت وەرگرتووە، ئایا گەشبین بوویت، یان نا؟**

گولی تەرەقی: من نامۆم بە پێچوپەنا و فڕوفێڵە سیاسییەکان لە ئێراندا. سیاسەت دنیای من نییە، بەڵام دەتوانم بڵێم لە سەردەمی "بەڕێز ڕۆحانی"دا بوو کە دوو کتێبی من، "دەرفەتێکی دووبارە" و "ڕووداو"





مۆڵەتیان وەرگرت؛ بۆیە دەتوانم بڵێم: ئێستا "ئیرشاد" جیاوازیی هەیە لەگەڵ ڕابردوودا.
تاکە مەترسیم ئەوەیە دیسان بگەڕێینەوە بۆ شوێنی یەکەم. هەمان تاس و حەمام.

ئەم باسە زۆر باوە کە دەڵێن دەبێ سانسۆر یەکشەوە بپێچرێتەوە، هەندێکیش لەو باوەڕەدان دەبێ ئەم کارە وردەوردە بکرێت. ڕای ئێوە چییە؟
گولی تەرەقی: یەکشەوە؟ یانی شەو بنووین و بەیانی بەئاگا بێینەوە و ببینین پێنج هەزار کتێب مۆڵەتی چاپیان وەرگرتووە؟! لابردنی سانسۆر ڕووداوێکی نامومکینە و من دڵم بەم وەهمانە خۆش ناکەم.
ئاخر چۆن دەست دەدا سانسۆر یەکشەوە بپێچرێتەوە؟ مەگەر ئێمە لە کوێ دەژین؟ ڕەنگە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، هەندێ دەرگا بکرێنەوە، ڕەنگە... ئەگەری ئەوەش هەیە خراپتر ببێت. سانسۆری سەردەمی "بەڕێز ئەحمەدی نەژاد" لە ڕاستیدا سانسۆرێکی بێمانا بوو. هیچ هۆکارێك نەبوو بۆ لابردنی دێڕێك، من خۆم لە کاتی نووسیندا ئاگاداری هەندێ لە حەساسییەتەکان هەم. لە چەند شوێنێکی ئەم ڕۆمانەشدا ئەو تێبینییانەم جێبەجێ کردووە، هەڵبەت تۆزێکیش پەشیمانم، چونکە لەوانەیە بکرایە بەسەریاندا تێپەڕێت! بەڵام لە سەردەمی "ئەحمەدی نەژاد"دا تێنەدەگەشتی چی بە هێڵی سوور دادەنێن و چی نا... بۆ نموونە، بۆ ڕۆمانی "بەڕێز ئەلف" (کە دەمەوێ دووبارە بگەڕێمەوە سەری) ڕەخنەیەکی هێند ناماقووڵیان گرت، کە عەقڵ نەیدەبڕی؛ نوکتە بوو. بەشی یەکەم لە کتێبی "یادەوەرییە پەرشەکان" بڵاو بووبووەوە، بەڵام مۆڵەتی چاپی هەموو ڕۆمانەکەیان نەدا. وتیان ئێوە بۆتان نییە ئەم کارەکتەرە (بەڕێز ئەلف) کە پیاوێکی بەڕێز و موسڵمانە و مامۆستای مێژووە، بنێرن بۆ شاری پیس و گەندەڵی پاریس! ئاخر ئەمە سانسۆرە؟!!



وتیان ئەو شارە بۆ ئەم کەسە مەترسیدارە. وتم دڵنیا بن من ئەم مرۆڤە دەناسم. لەم ماوەیەدا دەمی بۆ خواردنەوە نەبردووە و هیچ کارێکی نەکردووە، کە پێچەوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بێ. وتیان یانی تۆ لە ئێمە باشتر دەزانی؟ بە خۆمم وت نەکا (ئەلف) ژێربەژێر کۆمەڵێ کار بکات من بێخەبەرم لێیان؟ بەهەرحاڵ، دوای ڕوونکردنەوە چرتوپرتەکانی من، فەرموویان بەو مەرجە بۆت هەیە، تەنیا ئەم بەشەی یەکەم چاپ بکەی، کە لە کۆتاییدا "ئەلف" بە خێرایی بگەڕێتەوە! پرسیارم کرد ئەی بەشەکانی تر چییان بەسەر دێت؟ وتیان پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە. منیش، بتەوێ و نەتەوێ، کەوتبوومە ناو ئەو یارییەوە. وتم حاڵی حازر پارەی کڕینی بلیتی نییە! فەرموویان لە دەزگای بڵاوکردنەوەکەتانی وەربگرن!!! ئەمە بۆ خۆی چیرۆکێکە...

لە ڕۆمانی "ڕووداو"دا، دوو ڕیتم لە سێ پارچەی ڕۆمانەکەدا بەکار دەهێنی. یەکەم ڕیتمێکی پڕ لە وردەکاری و ڕووناکی و ڕەنگ و بۆنە، کە زۆرتر لە سەردەمی منداڵی و پیریی پاڵەوانەکانتاندا دەبن بە ڕیتمی زاڵی ڕۆمانەکە؛ دووهەم ڕیتمێکە وەسف ناکرێت و ئەساسەکەی حەکایەتە، کە بۆ ناوەڕاستی ڕۆمانەکە و تەمەن ناوەنجیی کارەکتەرەکان بەکاری دەهێنی. ئەم دابەشکردنە چ هۆکارێکی بینایی بۆ ئێوە هەیە؟ بەو مانایە دەتانویست بە ڕیالیزمی هەمەلایەنەی بەشی ناوەڕاست، شیعرییەتی سەردەمی منداڵی بسڕنەوە؟

گولی تەرەقی: بۆ بیسڕمەوە؟ وەختێ لەبارەی مرۆڤێك لە زەمەن و دۆخێکی تایبەتدا دەنووسم، زمان و تێکست و دەنگەکەی خۆیان بەسەر مندا دەسەپێنن. منداڵی سەردەمێکی جادووییە، سەردەمی خەو و خەون و خەیاڵە. تەنانەت لە خراپترین دۆخیشدا، لە سەردەمی منداڵیدا دەتوانن سووچێ بۆ خۆتان بدۆزنەوە و لە دونیای خەیاڵدا ون ببن، وەکو ئالیس لە سەرزەمینی سەمەرە. توانای ئارەزووکردنتان هەیە، وەسفکردنی سەردەمی منداڵی زمانێکی شیرین و شاعیرانەی دەوێ. شیعری "ئەو ڕۆژانە"ی "فروغ" باشترین نموونەیە. چەند دێڕێکم لە یاد ماوە. با بیڵێم:

ئەو ڕۆژانە تێپەڕین

ئەو ڕۆژانەی جەزبە و سەرسامی

ئەو ڕۆژانەی خەو و بێداری





ئەو ڕۆژانە هەر سێبەرێك نهێنییەکی هەبوو
هەر پاکەتێکی سەرداپۆشراو گەنجینەیەکی دەشاردەوە.
هەر سووچێکی خەزێنەکە، لە بێدەنگیی نیوەڕۆدا
دەتوت جیهانێ بوو...
باشە ئیتر، لەوە زیاترم لە یاد نەماوە. مەگەر دەکرێ ئەم شیعرە شیرین و نۆستالژیکە بە شێوازی پتەو و پڕشکۆی "ئەرخەوان" بنووسرێت؟
هەر دنیایەك یاسای خۆی هەیە. فۆرم و ناوەڕۆکی تێك ئاڵاون. لە بەشی یەکەمی ڕۆمانی "ڕووداو"دا شادی و نادر منداڵن. لە کەنار دەریادا لەدایك دەبن. ئاشنان بە پێچوپەنای دەریا و لە زمانی ئاو تێدەگەن. سەرەنجامیش دوای ساڵانێکی زۆر جودایی، لە کەنار دەریا بەیەك دەگەنەوە و ژیانێکی نوێ دەست پێدەکەنەوە. دەریا ڕۆڵێکی گرینگ و سەمبۆلیکی لە ڕۆمانەکەدا هەیە.

کاراکتەری بیانی لە ڕووسی و پۆڵۆنییەوە بیگرە تا... لە دونیای چیرۆکی ئێوەدا زۆر زۆرن. ئایا ئەمە لەبەر ژیانی تایبەت و چینی کۆمەڵایەتیتان بووە، یان بەگشتی حەزێکی چیرۆکیت بۆ ئەم کەسانە هەیە؟
مرۆڤگەلێکی سەرگەردان لە تارانی ئەو ساڵانەدا...
گولی تەرەقی: یەکەم کچی "ڕووس"م لە چیرۆکی "هاوڕێی چکۆلە"دا هێناوە. کچێکی ڕووس دێت، هاوڕێی چکۆلە و عەشقی منداڵیمم لێدەستێنێت. یەکەم ئەزموونی ململانێ. چیرۆکەکەم لە "یادەوەرییە پەرشەکان"دا نووسیوەتەوە.
لە قوتابخانەی سەرەتایی "فیروزکوهی" کچێکی بیانی هاتە پۆلەکەمان. هیی دنیایەکی تر بوو. شۆخ، بە قژێکی کاڵ کە وەك کلکی ئەسپ بەستبووی. من ئەو کاتە دە ساڵان بووم، بەڵام بە بوونی ئەو، هەستم بە دڵەڕاوکێیەکی سەیر کرد.





دەمزانی ئەم کچە، (سوتلانا)، هاورێکەم لێدەستێنێت، هەر وەهاش دەرچوو. ئەم ڕووداوە و ئەو دڵەڕاوکێ سەیرە، لە شوێنێکی تاریك لە قووڵایی زەینمدا نیشتووەتەوە و هەتا ئەمڕۆ، وەخت و ناوەخت یەخەم دەگرێ و ئازارم دەدا، ڕەنگە "تانیا" لە ڕۆمانی "اتفاق"دا وەرگێڕاوێك بێت لە "سوتلانا"، لە ڕووی ڕوخساریشەوە لەو دەچێ. لە سەردەمی مێرمنداڵیمدا تاران زۆر هاووڵاتیی ڕووسیی تێدا بوو، شوێنەکەشیان بەگشتی لە شەقامی "قوام السلطنه" بوو، بەرامبەر قوتابخانەی "ئەنوشیرەوانی دادگەر". ژن و مێردێکی ڕووس لە دوو ژووری بچووکدا دەژیان. تەمەنیان لە سەرووی هەشتا ساڵەوە بوو. پیاوەکە، (کە ناومان لێنابوو موسیو) وانەی شێوەکاریی دەوتەوە و ژنەکەش وانەی زمانی فەڕانسی. هەردووکیان لە خێزانێکی خانەدان بوون، لە سەردەمی شۆڕشی بەلشەفیکیدا پەنایان بۆ ئێران هێنابوو، ئەوێ یەکەم پۆلی شێوەکاریی من بوو. بیرمە یەکەم ڕۆژی دەورەکەم کتێبێکی شێوەکاریی "سێزان"ی پێدام و وتی بە وردی سەیری بکەم. "ئێمپێرسیۆنیست"ەکان لە ئێراندا نەناسرابوون. هەندێ جار کە زوو دەگەیشتمە پۆلەکەم، باسی ڕابردوو و ژیانی خانەدانیی خۆی بۆ دەکردم. باسی شکۆ و خۆشگوزەرانییەکانی دەرباری ڕۆمانۆف. هەموو ئەمانە وەك فیلمێکی سینەمایی دەهاتنە پێشچاوم و وێنەیان لە زەینمدا دەمایەوە، هەتا ڕۆژێك لە چیرۆکێکدا ڕەنگ بداتەوە. لە لایەکی ترەوە، ئاشقی ئەدەبیاتی ڕوسیا بووم، بەتایبەتی دۆستۆیڤسکی. نوقمی ئەو جیهانانە دەبووم، کە ئافراندبوونی. مەگەر دەکرێ "دیمیتری کارامازۆڤ" لە یاد بکرێ، یان ئاشقی "پرەنس میشکین" نەبێت؟

دواتر لە بەشی گێڕانەوەی تەمەن ناوەنجیدا ڕیالیزمێکی لەڕادەبەدەر بەکار هاتووە و دوای ئەوەش بەشی بەساڵداچووییت بە ڕیتم و شێوازی زمانیی سەردەمی منداڵی نووسیوە...

گولی تەرەقی: لە دەورانی کامڵبووندا ئاگایی و واقیع و بەرپرسیاریەتی جێگەی خەونەکانی منداڵی دەگرنەوە. تەنانەت ئەگەر وەکو منیش ئەهلی سازوسەودا بیت، ناتوانی خۆت لە کێشی قورسی واقیع و بەرپرسیاریەتی لا بدەیت. مشتومڕ لەگەڵ ئەشێوناشێی کۆمەڵایەتی و خێزانی، دوای تەمەنی مێرمنداڵی دەست پێدەکات. خواتان لەگەڵ بێخەیاڵی و سەروەتەکانی منداڵی. لەم قۆناغە بەدواوە، ڕووداوە کتوپڕەکان یەك لە دوای یەك ڕوو دەدەن. دوانەکان کە ئاشقی یەکترن، ئەگەر جیاتان





بکردنایەتەوە، دەمردن، بە ڕوودانی ڕێکەوتێك کە هەرگیز بە خەیاڵیشدا نەدەهات، لە یەکتر جیا دەبنەوە. ئایا پێویستییەك لەم کارەدا هەبوو؟ ئایا ئەمە یاریی نهێنیی چارەنووس بوو؟ ئایا دەستی خودایانێکی چاوچنۆك لە ئارادا بوو؟ نازانم. پێم خۆشە کەسێك پێم بڵێت. من لە کاتی نووسیندا بیرم لەم شتانە نەکردبووەوە. دەتگوت کەسێکی تر کە لە دەروونمدا شاردراوەتەوە، هێڵە سەرەکییەکانی پێدەوتمەوە. وەکو خۆشەویستیی دوانەکان بۆ یەکتری. چاوەڕوانیی بەیەکگەیشتنیان. مردنی پێشبینینەکراوی باوك و هاوسەرگیریی شادی لەگەڵ پوشکین. نادر لە ئەمریکایە و شادی لە تارانە. لەم قۆناغەی ڕۆمانەکەدا ڕووبەڕووی ڕاستییەکانی شۆڕشی ئێران و جەنگ و بێکارەبایی و نەخۆشیی دایکی شادی دەبینەوە. زمانی ڕۆمانەکە بۆ خۆی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ڕیالیست و توندوتیژ دەبێتەوە. ئەمە سروشتییە. بەشی سێیەم، یانی گەڕانەوەی "نادر" مژدەی لەدایکبوون و ژیانێکی نوێ دەدات. خانووە دێرینەکە دەفرۆشرێت، (کە بووە بە شوێنی نیشتەجێبوونی ڕۆحەکان)، خانووە تازەکە لە تەنیشتی دەریایە. شوێنی لەدایکبوونی دوانەکان. بۆنی دڵخۆشی و ئومێد دێت، بۆنی منداڵانی داهاتوو؛ بۆیە زمانێکی سووك و شۆخوشەنگ و بەختەوەری پێویستە. ئایا زانیوتانە لە کۆتاییدا وەختێ "نادر" و "شادی" لە کەنار دەریا دانیشتوون، منداڵێك کە دیار نییە لە کوێوە هاتووە، لە دوورەوە تێدەپەڕێ و دەست بۆ دوانەکان ڕادەوەشێنێ؟ ئەمەش یەکێك بوو لەو ڕووداوە چاوەڕواننەکراوانە، کە کتوپڕ و لەسەر کاغەزەکە دروست بوو. نووسینی سێسەد لاپەڕەیی ئەم ڕۆمانە دەرفەتی پێدام بتوانم بڕۆمە ناو دونیای دەروونیی کارەکتەرەکانەوە، بەتایبەت پوشکین. خۆشەویستیی پڕتاسە و نەخۆشیئاسای ئەو بۆ شادی و خۆشەویستیی ئاوێتە بە تووڕەیی و کینە بەرامبەر بە دایکی. ڕابردووە سیاسییەکەی کە لە وەهمێك زیاتر نییە. ترسی لە مەرگ، کە بەرەو خۆکوژیی دەبات. بە وتەی "ئاغای فانی"ی خۆشەویست، کە لەبارەی ڕۆمانەکەوە قسەی لەگەڵ کردم، "ڕووداو" ڕۆمانی ئەشقە، کۆمەڵێك ئەشقی یەکلایەنە، جگە لە خۆشەویستیی دوانەکان بۆ یەکتر.

لە زۆربەی بەرهەمەکانتاندا کاریگەریی ڕووداوە سیاسی و مێژووییەکان لەسەر شانی کارەکتەرە

ژنەکانە. ئەوانن کە ڕاستەوخۆ بەردەنگی ئەنجامی بەسەرهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئێران دەبن. لەم حاڵەتەدا کارەکتەرە پیاوەکان تا ڕادەیەکی زۆر لە ئارادا نامێنن و ژنەکانن کە دەبێ بوەستن و سەیری ئەم ڕەوتە مێژووییە بکەن. ئایا ژنەکانی ئێوە زیاتر لە مێژوو تێدەگەن؟

گولی تەرەقی: سەیری بکەن، ژن بۆنەی ئافراندنە. لە منداڵدانی ئەودا ژیان دروست دەبێت و ئەو گەرەنتیی مانەوەی نەوەکانە. کۆمەڵگە سەرەتاییەکان دایکسالار بوون و یەکەمین ئیزەدەکان مێینەن. هەڵبەت لەناکاو دایکی گەورەی گەردوون وەلاوە دەنرێت، مەریەمی پیرۆز لە پشتەسەری مەسیح ڕادەوەستێت، بەڵام بەردەوام بوونێکی بەهێزی هەیە. واز لە ئۆستوورە بهێنین و ژن لە واقیعی ئەمڕۆی خۆیدا ببینین. لەوانەیە ژن نەتوانێت وەکو پیاو ڕاستییە مێژووییەکان لێك بداتەوە، بەڵام بەهرەیەکی سروشتی و ئاگاییەکی ژنانەی هەیە. دونیای ژن، ئەشق، یان "ئێرۆس"ە و دونیای پیاو، ئەقڵ و مەنتیق و "لۆگوس"ە. باسی باشیی یەکێکیان لە ئاستی ئەوی دی ناکەین، باسی دوو شێوازی ڕوانینە بۆ ڕاستییەکانی ژیان و دوو پانتایی دەروونی و سایکۆلۆژییە، کە پێویستە لە ئاشتی و هاوسەنگیدا بن؛ بەڵام لە دونیای ئەمڕۆدا ئەم هاوسەنگییە تێك دراوە. پیاوان، "ئانیما"، یان ژنی دەروونی خۆیانیان فەرامۆش کردووە، بوون بە کۆمەڵێ "دۆن جوان"ی تاکلایەن و بەردەوام بە دوای خۆشەویستییەکی کاتییەوەن، کە تێریشیان ناکات. کۆمەڵێ ژنیش بە دروشمی فیمینیستییەوە، ژنبوونی خۆیانیان لە یاد کردووە و دەستیان کردووە بە ڕکەبەرایەتیی پیاوان. لە ڕۆمانی "ڕووداو"دا، "نادر" پێویستی بە "شادی"، یان تەواوکەری ژنانەی خۆیەتی. ساتێك درەنگتر لە ئەو لەدایك بووە و دڵەڕاوکێی ئەم ساتە تەنیاییەی لە بیر ماوەتەوە. لە پشتەوەی بەرگی کتێبەکەدا و لە ڕوونکردنەوەی وێنەی دوانەکان، پرسیار دەکەم "شادی" چی بە گوێی "نادر"دا دەچرپێنێ؟ پێم وایە دەڵێ: "نادر، مەترسە من هەمیشە لەگەڵتدام". وەکو ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ئاگاداری جوداییەکەیان بووبێت. "نادر" هەتا بوونی خۆی بەبێ شادی نەدۆزێتەوە، ناتوانێت بگەڕێتەوە. دەبێ ساڵانێك سەختی بکێشێت و لە هەمان کاتدا کە "شادی" نیوەکەی تریەتی، ژیانی ڕاستی و سەربەخۆی خۆی لەو پێناسە بکات. پێم وایە ئەم قسانە وەڵامی پرسیارەکەی ئێوە نەبوون. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت، کە ماندوو بووم و دەمەوێ خۆم دەرباز بکەم!





له چیرۆکەکانی ئێوەدا و هەروەها له ڕۆمانی "ڕووداو"یشدا، چەمکی "ماڵ" ڕۆڵێکی سەرەکیی هەیە. دونیای مرۆڤی ئێوه بە ماڵ و خانوودا تێك ئاڵاوە، یان خەریکی پاراستنی خانووە، یان له پێناوی بەدەستهێناوەیدا شەڕ دەکات، یان دڵخۆشە پێی. خانوو خاڵی بەریەککەوتنی هەموو جووڵەکانی گێڕانەوەتانە، که له ئەنجامدا بە ئاسوودەیی کۆتایی دێت.

گولی تەرەقی: لەبەر ئەوەی خانوو شوناس بۆ مرۆڤ دروست دەکات. هەر ئەم خانووەی ئێستا تێیدا دانیشتووین، خانووی دایکمە، که لە دوای مردنی بە میراتی بۆم ماوەتەوە، بەڵام من بەردەوام خەون بە خانووی "شێمیران"ەوە دەبینم، خانووی منداڵیم. خانوویەك که باوکم دروستی کردبوو، خانووی خێزانەکەمان بوو. جێگەی باوکم بوو که وەختێ لەسەر کورسییەکەی، لەژێر کەپرەکەدا دادەنیشت، سێبەرەکەی تا بنی باخەکە دەڕۆشت. هیچ کەس لە باخی شێمیراندا بیری لە مردن نەدەکردەوە. مانایەکی ئانتۆلۆژیکی بوو. ئێستا نە ئەو خانووە ماوە و نە ئەو خێزانە. شۆڕش ئەندامانی خانووەکەی پەرتەوازە کرد، بەڵام یادەوەریی ئەو خانووە و نۆستالژییەکەی لەگەڵمدایە.



بۆچی ئەم نۆستالژییەتان بۆ گرینگە؟ هەندێ لە ڕەخنەگرانی بەرهەمەکانتان دەڵێن ئێوە سەرقاڵی بەپیرۆزکردنی ڕابردوون. بۆچی لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەییەوە سەیری ئەو ڕابردووە ناکەن؟

گولی تەرەقی: مەگەر دەتوانرێ هێڵێك لە نێوان ڕابردوو و داهاتوودا بکێشرێت؟ مەگەر دەتوانرێ منداڵی لە تەمەنی ناوەنجی و پیری جیا بکرێتەوە؟ داهاتوو لە سکی ڕابردوودایە. بۆ نموونە، من ناتوانم کارەکتەرێك بخوڵقێنم بەبێ ئەوەی سەیری ڕابردووی بکەم، هەروەها بۆ خۆیشم، بەبێ دەرکی ڕابردووم... یادەوەرییەکان بەشێکی نەمرن لە ئێمەدا. مرۆڤی

بێیادەوەری، بوونەوەرێکی تاکلایەنە، بەڵام من ڕابردوو بەپیرۆز ناکەم، ئەسڵەن باش و خراپی هەڵناسەنگێنم. لە "یادەوەرییە پەرشەکان" و "دوو دونیا"دا مەبەستی من سەرەڕای نووسینەوەی جۆرێك لە ژیاننامە (کە زۆریش ڕاست نییە)، بەرچاوخستنی قۆناغێکی مێژوویی و کولتووریی کۆمەڵگە بووە لە ساڵانی پێش شۆڕشی ئێراندا. مانەوە لە حەسرەتی ڕابردوودا بەر بە پێشکەوتن دەگرێت، بەڵام وەختێك لەو حەسرەتە دێینە دەرێ، کە بیبینین و بیناسین. بەپیرۆزکردنی ڕابردوو نا، ناسینی ڕابردوو...
زۆر بە کەمی کەسێك تا ئەم ڕادەیە گاڵتەی بە بەها بورژوازییەکانی خێزانەکەی خۆی کردووە. کوێی ئەم یادەوەرییانە پیرۆزکردنی ڕابردووە؟ ئەمانە قسەی هیچوپووچن! سەد جار وتوومە، یادەوەرییەکان پێش ئەوەی یادەوەری بن، چیرۆکن. بابە گیان چیرۆکن...! ئیتر وازم لێبهێنن... ئەگەر ناتانەوێ تێبگەن، کێشەی خۆتانە. دەبوایە ئەم چیرۆکانەم بنووسینایە و دەرگایەکم بەرەو لای ڕابردوودا دابخستایە، دواتر بەرەو دونیایەکی تر بەڕێ بکەوتمایە. بڕۆشتمایە بە لای ئەزموونی تازەوە، غوربەت لە پاریسدا...

بەڵام جگە لە یەك چیرۆك، پاریس ئەسڵەن بوونی نییە لە کارەکانتاندا...
گولی تەرەقی: زۆر ڕاستە. سەرەڕای ئەوەی سیوچوار ساڵە لەو شارەم، کەچی هێشتا هیچ شتێك نەیبەستووەتەوە بە منەوە.

وا دیارە ئێوەش لە "بەڕێز ئیبتیهاج" دەچن، ئەویش دەیوت دوای ئەو هەموو ساڵە ژیان لە ئەڵمانیا، هیچ پەیوەندییەکی بەوێوە نییە و تەنانەت زمانەکەشیان فێر نەبووە!
گولی تەرەقی: لەبارەی منەوە، پێم وایە جۆرێکە لە خۆڕاگری، یان ترس لەوەی نەکا ئیتر نەگەڕێمەوە و لەوێ بمێنمەوە. لەو ڕۆژەی ئێرانم بەجێ هێشتووە، بیرکردن لە گەڕانەوە لەگەڵمدا بووە، تەنانەت ئەو کاتەش کە لە ئەمریکا دەمخوێند. فیلمی "ئی تی"ت لە بیرە؟ ئێستا سەرقاڵی نووسینی ڕۆمانێکم بە ناوی "گەڕانەوە". سەفەرە یەك لە دوای یەکەکانم بۆ تاران، وانەوتنەوەم لە دەزگای "کارنامە" و نیشتەجێبوونی چەندین






مانگەم لە تاران، یان سەفەرە کورتەکانم لە ئێران، هەموویان بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەن: ئایا کارەکتەری چیرۆکەکەی من دەمێنێتەوە، یان دەگەڕێتەوە؟ ئەوم پێش خۆم ناردەوە، بۆ ئەوەی بزانم چی دەکات. بڕیاری ئەو چارەنووسی منە. ژنی ناو چیرۆکەکەم گەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی خانووەکەی بە دەست بهێنێتەوە و هەروەهاش مێردەکەی لە ژنێکی گەنج... چەندین جار پێم وتووە خانم، وەرە و دەست لەم خانووە کەلاوە و لەم مێردە ئالوودەیە بشۆ، بەڵام ئەو تێناگات، چاوەڕوانم بزانم چی دەکات.

لە کارەکانتدا ئەو کەسایەتییانەی کە لە شوێنی شوناسیی خۆیان دوورن، زۆر ڕەها و پەرێشان دێنە بەرچاو، وەکو پوشکین لە ڕۆمانی "ڕووداو"دا. کارەکتەرێك کە بە ڕای من پوختەترین و فرەلایەنترین پێرسۆناژی ڕۆمانەکەتانە، کەسێکە بۆ هەمیشە نازناوەکەی لەسەری دەمێنێتەوە. مرۆڤێك کە ڕابردووی نییە. ڕاونراو و پلەدووە. ئایا ئەم کەسایەتییە هەر ئەو چەمکی "شەڕ" و "خراپە"ی ڕۆمانە کلاسیکەکان نییە؟

گولی تەرەقی: بۆ "شەڕ"؟ بەستەزمان...! پوشکین مرۆڤێکی برینداره. بارودۆخێکی تراژیکی هەیە. هۆکاری هەموو ئازارەکانی پوشکین ئەو خۆشەویستییەیە، کە دایکی پێی نەبەخشیوە. دایکە بێفیکر و خۆشگوزەرانەکەی. دەروونی پڕاوپڕە لەو برینانەی کە دەیانشارێتەوە، بەڵام لە قووڵایی زەینیدا بەردەوام بیر لە تۆڵەسەندنەوە دەکاتەوە. هیچ شتێك فەرامۆش ناکات، بەتایبەت دڵڕەقیی دایکی. "زەڕی خانم"، دایکی پوشکین ئاشقی کوڕەکەیەتی، بەڵام دەرفەتی پیشاندانی ئەو ئەشقەی نییە. من ئەم جۆرە کەسایەتییانە دەناسم، ژنێکی سادە و ساکار، بێخەیاڵ، وەکو بووکەشووشە، ژنێکی منداڵ... ئافرەتێکە بەردەوام لە میوانییە، ئاشقی خۆشگوزەرانی و قومارە. مێردەکەی وەکو بووکەڵەیەك، یان وەکو منداڵێك خۆشی



ئەوێ. کاتی ڕۆشتن بۆ میوانی جلەکانی بۆ هەڵدەبژێرێت و قژی دادەهێنێت، هەموو دڵخۆشیی ئەم مێردە ئەوەیە، ژنەکەی بۆی بگێڕێتەوە کە چەندە خۆشی لێگوزەراوە. پوشکین بە بینینی ئەم دیمەنانە ئازار دەچێژێت، دەیەوێت باوکی بکوژێت...

بەڵام پوشکین نەگۆڕا بە باوککوژێکی کلاسیك...
گولی تەرەقی: ئەو لە دەروونی بێئاگای خۆیدا باوکی دەکوژێ، وەکو هاملێت.

لە ڕاستیدا ناگاتە ئاستی دیمیتری کارامازۆڤ.
گولی تەرەقی: هەرگیز... پوشکین ئاشقی دایکیەتی و بێزارە لە باوکی، بەڵام خواستی لەناوبردنی باوکی دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆی، تەنانەت پێم وایە خۆکوشتنەکەی، لە ڕاستیدا کوشتنی باوکیەتی.

هەوەها ئەم مرۆڤە لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخی مێژووییدا، ڕۆڵ دەگۆڕێ و بەردەوام لە حاڵەتی ڕووخاندایە.
گولی تەرەقی: چونکە لە دەروونەوە لەرزۆکە. شاعیربوون و شۆڕشگێڕبوونەکەشی دەستکردە. دەیەوێ دەربکەوێت، بەڵام هیچ کەسێك حسابی بۆ ناکات.

لەبەر چی ناوی لە هیچ شوێنێکی ڕۆمانەکەدا نایەت؟ ئەم مرۆڤە بەردەوام بە تەزویر دەمێنێتەوە؟
گولی تەرەقی: نازانم. لە سەردەمی گەنجێتیدا، چونکە شیعری دەنووسی و قژی لوول بوو، هاوڕێکانی ناوی "پوشکین"یان لێنا. جۆرێك لە گاڵتەپێکردن بوو. ئەم ناوەی لەسەر مایەوە و منیش حەزم لێیەتی.

سەرەڕای ئەوەی ناوی ڕۆمانەکە "اتفاق"ە، بەڵام هیچ ڕووداوێکی سەرەکیی تێدا نییە. دەقەکە پڕە لە ڕووداوی بچووك و گرینگ، کە بەردەوام پێکەوە دەلکێن و بە خێرایی بەرەوپێش دەڕۆن، لەسەر هیچ





یەکێك لەم ڕووداوانەش ناوەستن. بەمە ڕووداوی سەرەکی لەناو دەبەن و فۆرمێکی کۆلاژئاسا ساز دەکەن.

گولی تەرەقی: کاتێك کتێبی "سەبووری لە گەردووندا"ی "لاجەوەردی"م دەخوێندەوە، تێگەشتم دروستبوونی ژیان و گەردوون لە ڕاستیدا ڕووداوێکە. چەندین جار ئەم دروستبوونە سەرەتاییە دەگاتە ئاستی لەناوچوون و دواتر بەستن یان وێکهاتنەوەیەك فریای یەکەمین ئەتۆمەکان دەکەوێت و ژیان بە ڕووداوێکی پەرجووئاسا دروست دەبێت. ژیانی دوانەکان لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا، لە تیری بەڵا پارێزراوە، هەتا ئەو کاتەی "تانیا" بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوە، یاخود ڕوونکردنەوەیەك ون دەبێت. ئەمە ئەو ڕووداوەیە، کە شەمەندەفەری چارەنووس بە ڕێگەیەکی تردا دەبات. هەموو بەسەرهاتەکانی دوایی بەستراونەتەوە بەم ڕووداوە سەرەتاییەوە. لە خۆم دەپرسم ئایا ئەم ڕووداوانە قەزاوقەدەر و ڕێکەوتن، یان پێویستی و حیکمەتێکیان تێدایە؟ ئایا ڕۆیشتنی "نادر" بۆ ئەمریکا پێویست بووە؟

ئەم ئەمریکایە، چەندە ئەمریکایەکی تایبەتە...

گولی تەرەقی: ئەمە ئەو ئەمریکایەیە کە باش دەیناسم. ساڵانێکی زۆر لە "دیمۆن ئایوا" ژیاوم و خوێندوومە. هەرێمێکی کشتوکاڵی و سارد بوو، لە ڕاستیدا شوێنێك بوو بۆ دیقکردن! ئەم هەرێمە لە ناوەڕاستی ئەمریکا بوو و خەڵکەکەی زۆر جیاواز بوون لە شوێنێکی وەکو نیۆیۆرك. میهرەبان و سوننەتی بوون، بە ڕۆحییەتێکی ئایینی. ئەو شتەی منی لەوێ هێشتەوە، میهرەبانی و ساکاریی سەیری خەڵکەکەی ئەوێ بوو. بۆ من کە تەمەنم نەدەگەشتە شانزدە ساڵ، ژیان لە شوێنێکی وەك نیۆیۆرك، ترسناك بوو؛ هەروەها بۆ "نادر"یش.

بە ڕای من، لە شوێنێك بەدواوە "نادر" لە ڕۆمانەکەدا ون دەبێت. دەڕوا بۆ مەکسیك و ئێمە هیچ شتێك لەو دەورانەی نابینین.

گولی تەرەقی: "نادر" دوای جیابوونەوەی لە "شیلا"، (هاوسەرە ئەمریکاییەکەی)، لەو بەندیخانەیەی

بۆ خۆی دروستی کردبوو، هەڵدێت. دەیەوێت دونیایەکی تر بدۆزێتەوە. ئەو ئەمریکایەی کە تا ئێستا تەنیا وەسفەکەی بیستووە. ئەگەر دوای نادر بکەوتمایە و هەموو سەفەرەکانیم بە وردەکارییەکانیەوە شی بکردایەتەوە، زۆر دوورودرێژ دەردەچوو. نەدەگونجا و هاوسەنگیی ڕۆمانەکە تێك دەچوو.

ئێوە لە چیرۆکی "باوك"دا، دێڕێکتان هەیە کە دەڵێ: "باوکم پۆڵا بوو و پۆڵا هەرگیز ژەنگ ناهێنێت". ئەمە ئایدیایەکی سەرەکیی دونیای کارەکتەرەکانی ئێوەیە، لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ باوکدا. لە کارەکانتاندا باوکەکان ڕۆڵێکی تۆختر و هەڵبەت خواستراوتریان هەیە بەراورد بە دایکەکان. هەرچەند ئەم باوکانە بزر دەبن، بەڵام تەنیا ئەوان پیاوە بەهێزەکانی ڕۆمان و چیرۆکەکانی ئێوەن. دایکانی چیرۆکەکانتان، بوونیان زۆرترە، بەڵام چارەنووسیان ڕەشتر و تەمەنیان درێژترە. ئایا ڕیشەی ئەمە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی خۆتان؟
گولی تەرەقی: بەڵێ. باوکی من بە ڕاستی هەر ئەو پۆڵایە بوو، کە ژەنگی نەدەهێنا. پانزدە ساڵ ململانێی لەگەڵ نەخۆشیدا کرد و بە هێز و توانای ئیرادەی خۆی مردنی دوور دەخستەوە. ئوستوورەی هێزێکی تەواو بوو. هەموو ئەو شتانەی کە دەبێ دەربارەی ئەو باسی بکەم، لە چیرۆکی "باوك"ی کتێبی "دوو دونیا"دا نووسیومن. ئەم پیاوە بەزەبرە تەنیا ژنێك کە لێی دەترسا، دایکم بوو! تەنیا ژنێکیش کە خۆشی دەویست، هەر ئەو بوو. ئەو کاتەی نەخۆش بوو، تەنیا دایکم بۆی هەبوو دەرمانەکانی بداتێ و دەرزیی لێبدات، تەنانەت وەختێ لە کلینیکێکی لەندەن خەوێندرابوو، هیچ پەرستارێك بۆی نەبوو نزیکی بکەوێتەوە.

بەڵام هەرچەندە دونیای ئێوە لەسەر بنەمای ژنبوون دامەزراوە، کەچی باوکانی چیرۆکەکانتان زۆر خۆشەویستترن.
گولی تەرەقی: باوکانێکی زۆر لە چیرۆکەکانی مندا نین. باوکی من ڕوخسارێکی خۆشەویستی نییە. خۆخۆشەویستە و هەندێ جار نامیهرەبانە. بوونێکی کاڵی لە ژیانی مندا هەیە. بەڵام پیاوێکی ڕەسەن و شایانی ستایشە. کەسایەتیی باوکی "نادر" لە ڕۆمانی "ڕووداو"دا میهرەبان و شیرینە.
"ژیان لە پاڵ ئەم باوکە، تێکەڵ بە ئەزموونی چێژبەخش بووە. تێکەڵ





بە سەرسووڕمان و هەیەجانە. لەگەڵ ئەم باوکەدا دەکرا چەندین سەعات گفتوگۆ بکەی، یاری بکەی، زۆران بگری، یان نیوەشەو لە خەو هەڵیسێنی و خۆت بخزێنیتە ژێر لێفەکەیەوە".

بەڵام دایکی دوانەکانیش، کەمتر نییە لە باوکیان، شۆخ و هونەرمەندە. جیاوازە لە هەموو دایکانی تر و دەروونی وێناکردنی ناسکی و ڕەسەنییەکی تەواوە. لە "یادەوەرییە پەرشەکان" و "دوو دونیا"دا لەسەر هەموو خێزانم نووسیوە، جگە لە دایکم. چەندین جار ویستوومە چیرۆکێك لەبارەی دایکمەوە بنووسم، بەڵام نەمتوانیوە. "ناتالی ساروت" تەمەنی لە نەوەد ساڵی نزیك بووبووەوە ئەوسا توانیی دەربارەی دایکی بنووسێت. وامدەزانی دوای مردنی دایکم دەتوانم چیرۆکێك لەبارەیەوە بنووسم، بەڵام ئێستا نۆ ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕیوە و هێشتا ئەو توانایەم نییە.

وابزانم کاتی ئەوە هاتووە لێرەدا گفتوگۆکەمان تەواو بکەین و بڕۆین پیاڵەیەك چای گەرم بخۆینەوە.

سەرچاوە: گۆڤاری "تجربه"، ژمارە **34**، سال چهارم/ بهمن ماه **93**



# گەمەی نێوان پەنجەرەکان لە دەقی "

**شادیە عەبدول**

ئەو پرسیارەی (چی ڕوو دەدات کاتێك بوونی مرۆڤ مانا و هەژموونی خۆی لە دەست دەدات)، سەرچاوەی دروستبوونی ئەو تەوژمە بوو، کە بونیادی دەق و تێم و نمایشەکانی شانۆی گۆڕی. ئەمەش لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە بوو، کە ڕووداو و کارەساتێکی گەورە بوو لە ئاست مرۆڤایەتیدا. بێگومان ئەم تەوژمە لە ڕێی پێشەنگیکردنی چەند نووسەرێکی وەك (سامۆیل بێکێت، یوژین یونێسکۆ، ژان ژینیە و هارۆڵد پینتەر...) بوو، کە گۆڕانی بنجییان لە دەقەکانیاندا کرد و فۆڕمێکی جیاوازی شانۆیان هێنایە ئاراوە، پاشان ڕێبازی شانۆی ئەبسۆرد دەرکەوت. ئەم شێوازە

نوێیە شانۆیەکی ئەرێنی نەبوو، وەڵامی ئەو پرسیارەش نەبوو، کە ئایا بوونی مرۆڤ بەهایەکی هەیە یاخود نا؟ بە پێچەوانەوە، دەلالەتکردن و بەیانکردنی بێمانایی و پووچیی ژیان بوو. گەڕان نەبوو بە دوای چارەسەردا، بەڵکو جۆرێك بوو لە هۆشداری و دڵنیایی بۆ ئینسان، کە دەبێت قبوڵی بکات کە لە ناو بازنەیەکی بێکۆتایی دووبارەی پووچییدا دێت و دەچێت.

تێمای شانۆییەکان لە جێی کێشە و ململانێ واقیعی و کۆمەڵایەتییەکان، بوونە ئاڵۆزی تایبەتمەندیی تاکەکان لە ناو خودی خۆیاندا و بەرامبەر دەوروبەریان. پووچیی مانای ژیان و هەستنەکردن بە وجودی تاك و ونبوونی تاکگەرایی لە نێوان هەموو جەنجاڵی و شلۆقییەکانی ژیاندا و تێکشان و ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکان لە نێوان ئینسان خۆی و دەرەوەی خۆیدا، بوونە تێما، پاشان فەزای گشتیی شانۆیان گرت. کارەکتەرەکان لە تایبەتمەندییە واقیعییەکان داماڵران و جۆرێك لە کارەکتەری ناواقیعی و نائاسایی دروست کران، لە پێناو خزمەتکردنی مەبەستییان لە تێکشکان و ئاڵۆزبوونی مرۆڤدا.



بێگومان نمایش و دیمەنی شانۆییەکانیش بەدەر نەبوون لە گۆڕانکارییەکان و ئەوانیش کاریگەر بوون بە هێما و سیمبۆلگەلێك، کە هەریەکەیان ئاماژەیان بۆ شتێك دەکرد و خوێندنەوەیان بە شێوەیەك بوو. ئەوەش بە جۆرێك فەزای شانۆی فراوان کرد، کە چیتر شانۆی لەوە تێپەڕاند بریتی بێت لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییەکی ڕووت و پێکەوەگرێدراو، بەڵکو جۆرێك لە کرانەوە بە ڕووی دەقدا دروست بوو، ئەوەش لە ڕێی شێوازی نوێی داڕشتنەوەی دەقەکان و دروستکردنی کۆتاییە کراوەکان. هاوکات بە ڕادەیەکی زۆر تاریکی هاتە ناو سینۆگرافیای دەقەکان و نمایشەکان، ڕووناکیی کەم و کز و ناجێگیر، مادەی ڕەق و





تێکشکاو، "کورسییەك، مێزێك، تەختی خەوێك، دەرگایەك یان پەنجەرەیەك" جێگەی سینۆگرافیا چڕ و ڕووناك و فراوانەکانیان گرتەوە. ئەوەش ئاماژەکردن بوو بە تێکەڵبوون و تێکچڕژانی نێوان مرۆڤی مۆدێرن و کەلوپەلەکانی ناو ژیانی. خودی ئەم گۆڕانە سەرتاسەرییەش هەمان ئارەزووی بینەر بوو بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی هاووێنەی خۆی، بە جۆرێك خۆی و ژیانی خۆی لەو چوارچێوەیەدا دەبینییەوە، کە ڕەنگی شانۆی گرت.
هێما و سیمبۆلە بەکارهێنراوەکان هەڵقوڵاوی تەوژمی ڕێبازەکانی سوریالی و ئەبستراکت بوون، چونکە هەر خودی ئەو هونەرانە نیشاندەری هەمان چڕی و جەنجاڵیی ژیانی مرۆڤ بوون لە ناو ئەندازە و هێڵ و تەریبە تێکەڵ و ئاڵۆزەکاندا، بۆیە نووسەری دەقەکان پشتیان کردە پێویستیی چڕی و فراوانیی تەختەی شانۆ و دەرهێنەرەکانیش لە نمایشەکاندا هەمان ڕێگەیان گرت.

گەر سەرنج بدەینە زۆربەی دەقە جیهانییەکان و نمایشەکانیان، لە نێوانیاندا چەندین سینۆگرافیای ئەبستراکت و سوریالی دەبینین، کە لە زۆربەیاندا پشت بە ئامێر و شتومەکی سادە و ساکار بەستراوە، بەڵام بوونە هێما و سیمبۆلی تایبەت و وەك سینۆگرافیا بەکار هێنراون و کاریان لەسەر کراوە. ئەو هێمایانەش زۆر و جیاوازن. هەر کام لە نووسەرەکان لە ڕێی بیرۆکەی تایبەت بە فەزای دەق و گونجاندنیان لەگەڵ دەقەکەدا بەکاریان هێناون، بێگومان ئەمەش پێکداچوونی نێوان پێکهاتەی بونیادی شانۆی زیاتر کرد و تەنانەت لە هەندێ دەقدا دەبینرێت کە پێکهاتەکانی سینۆگرافیا و تێمای دەق و کارەکتەرەکان بە جۆرێك پەیوەندییان بە یەکەوە



هەیە و پێکەوە گرێ دراون، گەر دەرهێنەر بیەوێت کاری جیاواز و شێوازی جیاوازی تێدا دروست بکات، ناتوانێت زۆربەی ئەو بەشانە فەرامۆش بکات، کە لە دەقە نووسراوەکەدا هاتوون، یان بە جۆرێکن، کە توانای گۆڕین و لابردن و زیادکردنیان نابێت. لەو ڕوانگەیەوە سەرنج دەخەینە سەر دەقی (کۆتایی گەمە/ سامۆیل بێکێت).

لە دەقی (کۆتایی گەمە)دا دوو پەنجەرە هەن. هەرچەند گەر ورد بینەوە لە زۆربەی دەقە جیهانییەکان، کەم تا زۆر بەر چەندین سیمبۆل و میتافۆری جیاواز دەکەوین، کە لە کۆی دەقەکان یان لە دەقی چەند نووسەرێکدا دووبارە دەبێتەوە. ڕەنگە لە زۆر دەقی تردا بەر بوونی پەنجەرەکان بکەوین. بەڵام لەم دەقەدا پەنجەرەکان تێکەڵن بە تێمای دەقەکە و کارەکتەرەکان بەرکەوتن و مامەڵەی زۆر نزیکیان لەگەڵیاندا هەیە، گەر بمانەوێت وەك بەشێکی جیاواز یاخود تەنها وەك بەشێك لە ئیکسسواری سینۆگرافیا سەیری بکەین، ئەوا بێگومان بە هەڵەدا چووین.

کۆی فەزای دەقەکە مشتومڕی کارەکتەرەکانە لەسەر ژیانیان و دەربارەی (چیم کرد و چیت کرد و چییان کرد، چی دەکەین و چی بکەین...) بەردەوام گفتوگۆ دەکەن. هاوکات گەمەی جەنگئاسای نێوان کارەکتەرەکان بۆ سەلماندنی وجودی خۆیان و مانەوەیان بەدی دەکەین. دەبینین زۆربەی گفتوگۆکان لە نێوان دوو کارەکتەردا (هام و کلۆڤ) ڕوو دەدەن و بەردەوام لە هەمان شوێندان، پاشان یەکێك لەو شتانەی چەندین جار لەبارەیەوە دەدوێن، پەنجەرەکانن. دەستپێکی سکین_ی دەقەکە بەم شێوەیەیە:

(ژوورێکی ڕووتوقووت...ڕوناکییەکی خۆڵەمێشیی دڵتەنگ. دوو پەنجەرە بە بەرزاییەکەوە بە دیواری لای ڕاست و چەپ بەرەو قووڵایی شانۆ هەڵواسراون. پەردەکان دادراونەتەوە لە پێشەوەی شانۆ لە لای ڕاست، دەرگایەك بە دیوارەکەوە قایم کراوە، لە نزیك دەرگاکەوە تابلۆیەك بە هەڵگەڕاوەیی هەڵواسراوە. لە پێشەوەی شانۆ لە لای چەپ دوو زبڵدان [دوو تەنەکەی خۆڵ] بەرامبەر بە یەك دانراون...).

تا ڕادەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین هەر کام لەو ئیکسسوارانەی هەن، ئەندازەیین و لە هەمان کاتدا بەشێك لە وێنەیەکی سوریالی دەخوڵقێنن بۆ کۆی سێتی شانۆییەکە. گەر سەرنج بدەین، بە درێژایی بەردەوامبوونی دەقەکە هەر کام لەم شتانە گەر بۆ ئاماژەیەکی بچووکیش بێت، ئاماژەیان پێدەکرێت و بەهایەکی تایبەت بە خۆیان هەیە. هەندێك جار بێکێت بەوە زۆر نیگەران بووە، کە هەر شتێك کە لەم دەقەیا هەبووە، لێی کەم





کراوەتەوە یان بۆی زیاد کراوە. ئەوەش ڕاستیی بوونی ئەوەیە، کە بێگومان بێکێت دەیەوێت تەنانەت بچووکترین شتێك کە لە دەقەکانیدا وەك سینۆگرافیا ئاماژەی بۆ کردووە، لە دەرهێنانی دەقەکانیشدا هەمان ئەرك و تایبەتمەندیی خۆیان پێبدرێتەوە. هەم دەرهێنەر توانای پێدانی ئەو تایبەتمەندییەی هەبێت و هەم ئەکتەر بتوانێت بە تەواوی لەگەڵ هەر کام لەو شتانەدا تێکەڵ ببێت و مامەڵەیان لەگەڵ بکات.

لەگەڵ دەستپێکی جوڵەکانی ئەکتەردا سەرنج دەخرێتە سەر پەنجەرەکان. کلۆڤ پاش سەیرکردنی بۆ هام بەرەو ڕووی پەنجەرەکان دەڕوات و بەردەوام لەو ماوەیەدا بە ناجێگیری و نائارامی سەیری پەنجەرەکان دەکات، وەك ئەوەی ترسێك لە سەیرکردنی دیمەنی ئەودیو پەنجەرەکان پیشان بدات.

هاتن و چوونی بەردەوامی کلۆڤ لە نێوان هەردوو پەنجەرەکەدا و تەماشاکردن و بەردەوام قسەکردنی لە بارەی ئەودیو پەنجەرەکانەوە، پرسیارکردنی بەردەوامی هام و ویستی ئاگاداربوونی لە فەزای ئەودیوی پەنجەرەکە، پرسیار لەبارەی ڕەنگ و چۆنێتیی دونیا و هاتن یان نەهاتنی کەشتیوانەکان... ئەو بڕوایە تێك دەشکێنێت کە کارەکتەرەکان و فەزای گشتیی شانۆییەکە لە دونیای دەرەوە دابڕاو و دوورن. چونکە بەردەوام کارەکتەرەکان لە گومان و دوودڵییەکدان بەرامبەر ئەودیو پەنجەرەکان و گفتوگۆی لەبارەوە دەکەن. بۆیە گەر ترس و ڕاکردن بێت یان حەز و بەرەوپیرچوونیان، کارەکتەرەکان بەردەوام شتێك دەیانبەستێتەوە بە دونیای دەرەوە، چی ڕوو دەدات یان چی دەگوزەرێت تێیدا، دەیانەوێت لێی ئاگادار بن.

هام: پەنجەرەکە بکەرەوە.

کلۆڤ: بۆچی؟

هام: دەمەوێ گوێ لە دەریا بگرم.

کلۆڤ: گوێت لێی نابێت.

هام: ئەگەر پەنجەرەکەش بکەیتەوە!؟

کلۆڤ: نا.

هام: کەواتە پێویست ناکا بیکەیتەوە؟

کلۆڤ: نا.

هام: (بە توندوتیژی) دە کەواتە بیکەرەوە.... پەنجەرەکەت کردەوە؟؟

کلۆڤ: ئا.

ئەوەی لە کۆتایی گەمەدا دەگوزەرێت، زۆربەی ڕەخنەگران وەك گەمەی دەسەلآت لە نێوان دەسەلآتدار و بێدەسەلآتدا وەسفی دەکەن، بێگومان ئەم گەمەیە پەرچەکرداری تێکشکان و شکستی کارەکتەرەکانە، کە بە درێژایی دەقەکە بەری دەکەوین، دەتوانین لە گفتوگۆ و شێوازی زمانی هەر کام لە کارەکتەرەکاندا درك بەوە بکەین. بێکێت زۆر ورد ئەم گەمەیە دەگوێزێتەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پەنجەرەکاندا، لە زۆر شوێندا هام دەسەلآتی خۆی دەسەلمێنێت بەوەی یارییەکی بەردەوام بە کلۆڤ دەکات لە نێوان هەردوو پەنجەرەکاندا و بە پرسیارکردنی بەردەوام و هاتوچۆپێکردنی خۆی و کورسییەکەی بە کلۆڤ بۆ لای هەر کام لە پەنجەرەکان کە دەیەوێت، ئەو گەمەیە درێژە پێدەدات.

هام: بمبەرە ژێر پەنجەرەك،ە دەمەوێت هەست بکەم ڕووناکی لە دەموچاوم دەدات.

هەرچەند بەردەوام دەسەلآتی هام بەسەر کلۆڤ و کارەکتەرەکانی تردا دەبینرێت، بەڵام تاکە شتێك کە هام لێی دەترسێت، ئەوەیە کە دەزانێت کلۆڤ توانایەکی جەستەیی لە ئەو زیاتری هەیە. گومان دەکات لە ناو ئەو گەمەیەی کە خۆی لەگەڵ کلۆڤ دەیکات، لە بەرامبەردا کلۆڤ گەمەیەکی شاراوە لەگەڵ ئەو بکات، گەر بیەوێت لە هاتوچۆی نێوان هەردوو پەنجەرەکان و لە بارودۆخی ئەودیو پەنجەرەکان درۆی لەگەڵ بکات و تۆڵەی ئەو دەسەلآتەی لێبکاتەوە، کە بەسەریەوە هەیەتی، دەشێ لە هەر کاتێکدا بێت، ئەوەی ئەو دەیەوێت بە پێچەوانەوە بیکات یان بە پێچەوانەوە پێی بڵێت. بۆیە تێبینی دەکەین کاتێك هام داوا لە کلۆڤ دەکات کە پەنجەرەکە بکاتەوە، سوێندی دەدات یان بە تووڕەیی و توندوتیژییەوە داوای کردنەوەی پەنجەرەکەی لێدەکات، یان پرسیاری لێدەکات و دەیەوێت تەنانەت بچووکترین دەسەلآت نەگەڕێتەوە بۆی، لە کاتێکدا دڵنیایە لەوەی کلۆڤ دەتوانێت هەر شتێك







بکات بەبێ ئاگاداریی ئەو. گەر بێئاگایی بێت یان نا، کلۆڤ هەمیشە گوێڕایەڵە و ئەوەی هام دەیەوێت، دەیکات، بەڵام ئاشکرا نییە ئاخۆ کلۆڤ دەیەوێت ئەو گەمەیە نەکات، یاخود کۆتایی بە گەمەکە بهێنێت.

هام: سوێندم بۆ دەخۆیت کە پەنجەرەکەت کردووەتەوە؟

کلۆڤ: ئا.

هام: چاکە، کەواتە دەبێ دەریا زۆر ئارام بێ؟.. پێت دەڵێم ئایا دەریا ئارامە؟

کلۆڤ: ئا.

جوڵە و هاتوچۆی بەردەوامی کلۆڤ لە نێوان هەردوو پەنجەرەکەدا گوماناوی و پڕترسە وەك ئەوەی چاوەڕوانی شتێك بێت، یان بیەوێت شتێك ڕوو بدات، بە پێچەوانەی هام کە ترسی لە ئێستا و ئەوەیە، کە ئێستا بە پەنجەرەکەدا تێدەپەڕێت.

لەگەڵ ئەوەی هام هەم نابینایە و هەم توانای ڕۆیشتنی نییە، بەڵام هەمیشە لە گومانێکی قووڵدایە و دەیەوێت ئاگادار بێت لەوەی لەودیو پەنجەرەکان. ئەوەش هۆکاری ئەو گرێ و ئاڵۆزییەی ناخی هام_ە لە بەرامبەر دەرەوە، کە شوێن و کاتە (زەمان و مەکان)، ئەو دوو شتەی کە لە ئاستیاندا دەسەڵاتی لە سفردایە و نەك توانای کۆنترۆڵکردن، بەڵکو توانای مامەڵەکردنێکی گشتیی وەك مرۆڤێکی ئاسایی نییە. بۆیە دەتوانین بڵێین هام بە تەواوی دڵنیایە لەوەی لە نێوان ئەو و پەنجەرەکاندا جەنگێکی تر هەیە، کە بەبێ هیچ بەرگرییەك هام تیایدا دۆڕاوە و توانای بەرەنگاربوونەوەی هیچ کام لە ئەو شتانەی نییە، کە لەودیو پەنجەرەکانەوە دەگوزەرێت، وەك چۆن توانای هەستپێکردنێکی ئاسایی و تەواویشی نییە بەرامبەریان.

کارەکتەرەکان قسە لەبارەی پەنجەرەکانەوە دەکەن، بێگومان لەودیو پەنجەرەکانەوە سروشت هەیە، ژیان، جەنجاڵی، با، باران و دەریا هتد.. هەیە. قسە لەبارەی پەنجەرەکانەوە لە نێوان ئەو گفتوگۆ و مشتومڕە قەرەباڵغانەدایە، کە کارەکتەرەکان لەبارەی ڕابردوو، ئێستا و داهاتووی ژیانیان هەیانە. بەڵام ئەوەی هەیە، تەنها قسە و گفتوگۆکردن نییە لەبارەی پەنجەرەکان و ئەودیوی پەنجەرەکانەوە، بەڵکو هەر کام لە ئەکتەرەکان ئەو جەنگەی بەرامبەر ئەویتر هەیەتی و بەرپای دەکات، لەگەڵ بچووکترین شتێکی بێگیانی وەك پەنجەرەکان تێکەڵی دەکات. لەم ڕێگەیەوە بێکێت بە تەواوی فۆکوس دەخاتە سەر بچووکبوونەوە و

ناچیزبوونی  هەموو شتێکی ژیان لە پەیوەندی و پێکەوەیی، جۆرێك لە کارەکتەر دروست دەکات تێکشکاو و ئاڵۆز و پڕ لە ترس و گومان، کە جەنگی بێمانایی  ژیانیان بە جۆرێکە، دەپەڕێتەوە بۆ ئاستی میتاڵێکی چوارگۆشە یان لاکێشە. بەڵام ئایا جەنگەکە لە نێوان هام و کلۆڤ تەنها پەنجەرەکەیە یاخود ئەو سروشتەیە، کە ئینسان خۆی بە تێکهەڵکێشی دەزانێت و هەمیشە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆی یاخود لێی دەربچێت، یان ئەوەی جەنگەکە لەگەڵ خودی کات و شوێندایە و ویستی ئینسانە بۆ دەستبەسەراگرتنی.

لە بارەی هەردوو  پەنجەرەکەوە هاوکێشەکان لە نێوان دوو کارەکتەردان، بێگومان ڕێکەوت بێت یان نا،  باس لە ناوەڕۆکی بوونی پەنجەرەکانە. (بەرامبەر یەك و سەربەرەوخوار هەریەك بەرەو ڕووی بەشێك لە دەرەوە و هەریەك لە سووچێکدا). بەرکەوتنی هەر کام لە کارەکتەرەکان جیاوازە، بەڵام بەرکەوتنەکە هەرچۆنێك بێت و لە هەر ئاستێکدا خۆی بگرێت، ویستی نووسەرە بۆ ئاماژەکردن بە (کەڵکەڵەی بەردەوامی مرۆڤ لە باوەشکردن بە سروشتدا یان ڕاکردن لێی، گشتاندنی تەواو نییە، بەڵام هەمیشە کەسێك دەڕواتەوە بەرەوشتەکانی ئەودیو پەنجەرەکان... باران، دەریا، با، دەنگ و بۆن، کەسێکیش لێیان تەری دەبێت).

بێگومان بوونی هەر چوارگۆشە یان هەر ئەندازەیەکی تری ناو بەتاڵ، کە نووسەر ناوی دەنێت پەنجەرە، بەردەوام بۆ خوێنەر و بینەر کەشفکەری دەروون و تایبەتمەندیی شێوازی ژیانی کارەکتەرەکانە، لەبارەی ژیان و تاریکی و ڕووناکیی ناوەوەیان. بەشێکی زۆری ئەو ئیشەی نووسەری دەق لەگەڵ دەقەکەدا کردوویەتی، دروستکردنی ڕۆحییەتێکی زیندووە  بۆ خاتریی نەمردنی دەق و پاشانیش نمایشەکەی. ئەمانە بەدەر لەوەی کە هەموو یەکێك لە ئێمە تەواو لەوەداین دەبێت پەنجەرەکە بکەینەوە بۆ ئەوەی بڕۆین بەرەو دەنگی دەرەوە یان نەیکەینەوە و خۆمان لەو سروشتە مەزنە بشارینەوە. گەر پەنجەرەکە بکەینەوە، دەکرێت سروشت دەستمان بەسەردا بگرێت و گەر دایبخەین سروشتمان داگیر کردبێت؟ چونکە پەنجەرەکان لەم دەقەدا تەنها پەنجەرە نین، بەڵکو لێکەوتە و پاشگر و پێشگری ژیانی کارەکتەرەکانن. ڕەنگە بە درێژایی دەقەکە، گفتوگۆکان سەبارەت بە پەنجەرەکان سادەترین بن، بەڵام زۆر بنجین و زۆر لە ناو ئینساندان. کە ئەمانە زۆر وردبینیی نووسەرەکانە لە ناو دیوارەکانەوە شتێکی گەورەی ڕۆحی ئینسان دەخوڵقێنن. بەدەر لە هەموو ماناو دەلالەتێك، بوونی پەنجەرەکان لە







دەقەکاندا دروستکەری وێنەیەکی نزیك لە ئەبستراکت و سوریالییە، کە خزمەت بە سینۆگرافیای دەقەکە دەکات. هەمیشە سینۆگرافیای ئەو دەقانەی پەنجەرەیەك یان چەند پەنجەرەیەکییان تێدایە، ڕێگە بۆ زیندووترکردن و فراوانترکردنی دەق دەکەنەوە، ئەمە جگە لەوەی کارەکتەر دەستبلاو دەکەن لە جوڵە و گفتوگۆکانیاندا شێوازێکیان هەبێت، چاوی بینەر ماندوو نەکات و هەمیشە گومانێك لای بینەر دروست بکات سەبارەت بە ئەودیو پەنجەرەکە و ئەوەی لێی دەگوزەرێت.

سەرچاوە: کۆتایی گەمە، سامۆیێل بێکێت، و/ مستەفا قەسیم، چاپی یەکەم، هەولێر-٢٠٠٧.